# بڕیار

«لەپێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا»

95

سالّی هەشتەم

ئایاری ٢٠١٦

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا





## دیداری تۆ!

- خزمەتی دایکم!
- دیارییەکەی باوکم!
- ڕێگای بەختەوەری!
- بڕیار ژوانی هەموومان
- خۆشەویستی کردارە!




# پیرۆزبایی

**بە ناوی سەرنووسەرو بەڕێوەبەرو دەستەی نووسەران‌و ستافی گۆڤاری بڕیارەوە، پیرۆزبایی لە بەڕێز:**

**د. مەسعود یونس ڕۆژبەیانی دەکەین، بە بۆنەی بەدەستهێنای بڕوانامەی دکتۆرای فەخری لە کارگێڕیدا، لە زانکۆی "الحضارة العالمية"**

**هیوای سەرکەوتن‌و تەمەندرێژی بۆ دەخوازین، بۆ خزمەتکردنی گەل‌و ئاوەدانکردنەوەی وڵات.**



RASAN
Group

**خاوەنی ئیمتیاز**

. مەسعوود تــاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

# No: 95

ئایاری

2016

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگــەرد فــــارس

زاهـــیـــر زانـــــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی هونەری و دیزاین**

جمال دەروێش

پشتیوان عبدالرحمن

ئارام محمد نەبی

**تایپ**

کەلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

**سلێمانی:** گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤

تەنیشت باخچەی بەکر صدقی، نزیك قوتابخانەی میدیای نمونەیی

٠٥٣٣٢٨٨٨٢٤ - ٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

**هەولێر:** ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

Bryar_magazine__

bryarmagazin@gmail.com

bryarmagazine

**چاپ:** پیرەمێرد

**دابەشکردن:** پەیك/ 07708649210

**نرخ:** 2500 دینار




**مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی**

## ساڵی هەشتەم - ژمارە 95 - ئایاری 2016










# کارگێڕیو بازاڕسازی




# بڕیار ژوانی هەموومان

ئەو كاتەی وشەی جوانو پەیڤی ڕەنگینو هەستی ناسكو خەندەی ئەرخەوانیو خۆشەویستیی بێسنوور، دەبێتە ژوانو دڵەپاكو بێگەردەكان بۆ پشووی ڕۆحیان، پۆل پۆل پەنای بۆ دەبەنو بە تاسەوە دێنە ژێر ساباتی ئەو ژوانە بێوێنەیە!

تابلۆیەكی وەها جوان، بە ژیان دەبەخشن، كە هیچ هونەرمەندێك نەتوانێ گوزارشی لێوە بكات!

پێشانگای ساڵانەی نێودەوڵەتیی كتێب لە هەولێری پایتەختی كوردستان، ژوانی كۆبوونەوەی خۆشەویستانو ئازیزانی بڕیارە.

لەوێدا، ئازیزان بە ژوانی خۆیان دەگەن، بە دیداری كتێبو بڵاوكراوەكانی بڕیار، چاویان سوورمەڕێژ دەكەنو بە گوڵاوی وشەی جوانو گوڵستانی پڕ لە گوڵو گوڵزاری جوان، مەست دەبن!

دیداری شەیدایانو خۆشەویستانی بڕیار، بۆ ئێمەی ستافی بڕیار، شەرەفێكی گەورەیە!

گەیشتنە حزووری كەسانێك، كە تەنها خۆشەویستیو دڵسۆزیو جوانیو هەستی پاك كۆمان دەكاتەوە، دەسكەوتێكی هەرەبڵندی ئێمەیە!

هەموو ساڵێك، بەتاسەوە، چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەین، كە لە چەند ڕۆژێكی بەهەشتیدا، بە دیداری دۆستانو خۆشەویستانمان شاد دەبین!

دیداری ئەم ساڵ، جیاواز بوو لە هەموو ساڵانی دی!

ئێمە قەرزاری هەموو خۆشەویستانو دۆستانو خوێنەرانی بەوەفاو قوتابیی قوتابخانەی بڕیارین!

قەرزاری هەستی بەرزو خۆشەویستیو تاسەی بێسنووری ئێوەین!

بەڵام ئازیزان، بڕیار هی ئێوەیە، ئێوە خۆتان خاوەنی بڕیارنو بڕیار لە ئێوەوە بۆ ئێوەیە، ئێمەش تەنها شاگردی قوتابخانە گەورەكەی بڕیارینو هەموومان بەیەكەوە، بڕیار بەرەو سەركەوتنو گەورەتر دەبەین!

بڕیار ماڵی هەموومانەو دەرگای ماڵو دڵی بۆ هەمووتان، هەمیشە واڵایە.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەگەر ڕاوبۆچوونەکان زۆربوون، کاروکردەوەکان کەم دەبنەوە.

مارکوس ئۆریلیۆس

هەندێك لە هاوسەران دەرمانن، هەندێکیشیان دەردو بەڵان.

ڤۆلتێر

تەلارەکان شارەکان دەڕازێننەوە، کەشتییەکان دەریاکان دەڕازێننەوە، منداڵەکانیشماڵەکان دەڕازێننەوە!

هۆمیرۆس

لاوەکان ڕوخسارێکی جوانیان هەیە،
بەساڵاچوانیش ڕوحێکی جوانیان هەیە!

پەندێکی سربی

تەندرووستیم پێ ببەخشە، لەبەرامبەردا سامانەکەم لێ وەربگرە

پەندێکی ئینگلیزی

# ڕێگای بەختەوەری!

دەگێڕنەوە: زانایەك لەگەڵ یەكێك لە قوتابییەكانیدا، بەنێو باخو بێستانی جووتیارێكدا دەگوزەران.

لە كاتی ڕۆیشتندا، چاویان بە جووتێ پێڵاوی دڕاو كەوت، كە پێ دەچوو، جووتیارەكە لە ماندوێتیدا، بۆئەوەی پشوویەك بە پێیەكانی بداتو نانەكەی بخوات، لەوێ دای ناون!

قوتابییەكە بە مامۆستاكەی گوت: چی دەڵێی، پێڵاوەكانی لێ بشارینەوە، بزانین چی دەكات؟!

مامۆستاكە بە قوتابییەكەی گوت: نا ڕۆڵەكەم، نابێت ئێمە بۆ دڵخۆشكردنی خۆمان، گاڵتە بە هەژارەكان بكەین!

تۆ دەوڵەمەندیو دەتوانی بە شێوەیەكی دی دڵخۆش بیت!

لەبری ئەوە، بۆ نایەی بڕێك پارە، بخەیتە نێو پێڵاوەكانی، پاشان خۆمان بشارینەوەو بزانین، كاردانەوەی جووتیارە هەژارەكە چی دەبێت؟!

قوتابییەكە، پێشنیاری مامۆستاكەی لا جوان بوو! هاوكات بڕێك پارەی خستە نێو پێڵاوەكانو خۆیو مامۆستاكەشی، لە پشت دارودرەختەكانەوە، خۆیان شاردەوە؛ تا بزانن هەڵوێستی جووتیارەكە، چی دەبێت!!

پاش چەند چركەیەك، جووتیارەكە پەیدا بوو، ویستی پێڵاوەكەی لەپێ بكات، بەڵام هەستی كرد، شتێكی تێدایە، تەماشا دەكات، بڕێك پارەیە، لە تاكە پێڵاوەكەی دیشدا، هەمان شت دووبارە بووەتەوە!

لە خۆشیدا، كەوتە سەر چۆكو دەستەكانی ڕووەو ئاسمان بڵند كردو گوتی: سوپاس ئەی پەروەردگارم، تۆ زانیت منداڵەكانم برسین، ئەم پارەیە، بەشی خواردنێكی زۆر دەكات!

مامۆستاكە، ئاوڕی دایەوە بۆ لای قوتابییەكەو پێی گوت: ئێستا بەختەوەرتر نیت لەوەی كە پێشنیاری یەكەمت جێبەجێ كردبا؟!

**لەم چیرۆكەوە فێر دەبین:**

١. هەژارەكان، بۆ ئەوە درووست نەبوون؛ تا گاڵتەیان پێ بكەین!

خودا بە دانایی خۆی، كۆمەڵێك هەژارو كۆمەڵێك دەوڵەمەند دەكات

٢. دەوڵەمەندیو سەروەتو سامان، پێوەر نین بۆ ڕێزگرتن لە مرۆڤەكان، بەڵكو پێویستە لە خودی خۆیانەوە، بۆیان بنواڕین.

٣. بە گاڵتەكردنو پێكەنین بە كەسانی هەژارو داماو، خۆشبەختی بەدەست ناهێنین، بەڵكو بەرامبەر مرۆڤایەتی خۆمان شەرمەزار دەبین!

٤. ببەخشە، تامو چێژی بەخشین، زۆر گەورەترە لە وەرگرتنو كۆكردنەوە!

٥. با مامەڵەكردنت بەرزو ڕاقی بێت، ئەگەر لەگەڵ پێڵاویشدا بێت، هەمیشە بیر لە بیرۆكەی بەرزو جوان بكەرەوە!

٦. با هەرگیز، مرۆڤ نەكەینە ئامانج بۆ كەیفو پێكەنینو ڕابواردن؛ چونكە گاڵتەكردن بە هەستو نەستی مرۆڤ، هەڵەیەكی زۆر گەورەیە.

٧. با هەمیشە ئاواتمان، خۆشحاڵكردنی مرۆڤەكان بێت، نەك ئازاردان!



# تەنها بۆ سەرکردەکان

01

بەڕای من سەرکردایەتی فێربوونە، کەواتە: ئەو ساتەی مرۆڤ لە فێربوون ڕادەوەستێت؛
ئەوا سەرکردایەتیکردنی ڕادەوەستێت، گەشەی دەزگاو دامەزراوەکەشی ڕادەوەستێت.

ریك وارن

02

هەرگیز نابیتە سەرکردەیەکی لێهاتوو،
گەر سەرەتا، نەبیتە خزمەتکارێکی لێهاتوو.

ئیلی لوفارو

03

هیچ کەس نابێتە سەرکردەیەکی لێهاتوو، ئەگەر هەموو کارێك خۆی ئەنجامی
بدات، یان بەدەستهێنانی هەموو سەرکەوتنێکی، تەنها بۆ خۆی بوویت.

ئەندرۆ کارینگی

04

پێگەیشتنی تاکەکانو گەشەکردنو پەرەپێدانی تواناکانیان،
بەرزترین هیوایە لای سەرکردەی ڕاستەقینە.

هارڤی ئێس.فایرستۆن

05

سەرکردەی ڕاستەقینە، پێویستە ئامانجی بەدیهێنانی بەرژەوەندیی
شوێنکەوتووەکانی بێت، نەك دەوڵەمەندکردنی سەرکردەکان.

روبێرت تاونسێند




## ڕەوشتو ئاکاری سەرکردە

بەشی سێیەم

# چۆن دەبیت بە سەرکردە؟

### سەرکردە چاونەترسە

بێگومان ئارەزووی بوون بە سەرتیپ، یان سەردەستە، هەر بۆ خۆی، دلێریو بوێرییە.

سەرکردەی ڕاستەقینە، بەزوویی هەوڵ دەدات، لە کارکردندا، شێوازێکی جیاواز دابهێنێت؛ تا باشترین شێوازی لێ دەربچێت.

سەرکردەی ڕاستەقینە نالێت: «گەر چەند هۆکارێکی قایلبەخشو مایەی ڕەزامەندی نەبن؛ ناتوانین ئەم شێوازو ڕێیە بگرینە بەر».

کاتێکیش کارمەندەکان، لە جێبەجێکردنی شێوازە تازەکانی کاردا، شکست دەهێنن؛ ئەوا سەرکردەی سەرکەوتوو، متمانەی پێیان هەر دەمێنێتو سەرزەنشتیان ناکات. هەر لەبەر ئەوەشە، ئەگەر لە پاش کەوتن، ئارەزووی هەستانەوەت نەبوایە، جار دوای جار حەزت لە دووبارەکردنەوەی هەوڵەکان نەبوایە؛ ئەوا توانای پێلاولەپێکردن، یان هەر جوان ڕۆیشتنو دەروژوورکردنیشت نەدەبوو.

### سەرکردە دووربینە

سەرکردەی ڕاستەقینە بۆ دوور دەڕوانێت، هەرگیز نالێت: ئەمە کاری من نییە، خۆئەگەر تۆ، لە دەستەکەت چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت، پیشتیوانیی یەکدی بکەن، لە کاتی قەیرانو تەنگانەکاندا، کاری سەختو ئەستەم ئەنجام بدەن، سەرەتا پێویستە لەسەرت، بۆ هەلگرتنی کۆڵو باری زۆرتر ئەگەر داوای ئەمەت لێ کرا خۆت سازو ئامادە بکەیت.

پاشان کاتێك کارمەندەکان، یارمەتیدانی بەشەکانی دیکەو ئەنجامگەیاندنی بڕێك کاری زۆرتر دەکەنەوە؛ پێویستە دووپاتی بکەیتەوە، کە دەزگاکە، یان کۆمپانیاکە، لە تەنگژەیەکی پڕمەترسیدایە.

سەرکردەی چالاك، گرنگییەکی گەورەوگران، بە گشت چالاکییەکانی دەزگا، یان کۆمپانیا دەدات، شەیدای زانینی هەموو ئەو شتانەیە، کە لە دەستەی کارگێڕیو لقەکاندا ڕوو دەدەن. هەردەم بێ خۆهەڵقورتاندن، یان دەستوەردانی لەڕادەبەر لە کاروباری کەسانی دیکە، لە بارودۆخی دەزگاو کۆمپانیا دەپرسێتەوە. سا لەبەرئەوە، ئەگەر سەرکردە ئارەزووی لە هەڵگەڕانی پلەکانی کار بێت؛ ئەوا ئەرکی سەرشانیەتی، کە لەبارەی بەشەکان، دەستە کارگێڕییەکان، دەستەکانی کارو بەڕێوەبەرێتییەکانی دیکەش، زۆر شت بزانێت، وەك کورد دەڵێت: بزن بۆ تاوێکیش بێت، جێی خۆی خۆش دەکات.

**سەرکردە یەکلاکەرەوەیە:** هەموو کات، سەرکردە ئامادەی بڕیاردانە، تا گرفتو کارەکان، بە لایەکدا بخاتو بیانبڕێنێتەوە. خۆ ئەگەر نەتزانیوە، ئەمە پێویستییەکی زۆری بە بوێریو چاونەترسی هەیە؛ ئەوا لێت ڕوون بێت، چۆن ببیت بە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو.

کاتێك زانیاریو ڕوونکردنەوە داواکراوەکان لە بەردەستدا بوون؛ بڕیاردان ڕوونو ئاشکراو ئاسان دەبێت، بەڵام بڕیاری سەخت ئەوەیە، کە لە سایەی نەبوونی زانیاریی پێویستەوە دەدرێت. گومان بێتو لەوەدا نییە، بڕیاردان، چاونەترسیو ئازایەتیی ڕاستەقینەی دەوێت، نەخوازەڵا کە ئەگەری ئەوە هەبێت، بڕیارەکە هەڵەیە. هەرچی دواخستنو خاووخلیچکیو تێمانو ڕاڕاییە، بەلگەیە لەسەر ترسانی بەڕێوەبەرو کەسێکیش نییە، ڕێز لە سەرکردەی ترسنۆكو زیرەکوشتوو بگرێتو دەستی بۆ بەسنگەوە بگرێت، یان سەری خۆی پێ بسپێرێتو پەیرەوی بکات.

### سەرکردە لێزانەو ڕێزگرتنیش باش دەزانێت

یەکێك لە ڕاستییە شاراوەکانی ژیان، ئەوەیە: تۆ بە هەنگوین، خەڵکی ڕادەکێشیت، نەك بە سرکە، یان کەس لە قسەی دڕکاوی، ترێی شیرینی نەچنیوەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێت، هۆکارە فریودەرەکانی دەسەڵات، وامان لێ دەکات، ئەم ڕاستییە لە بیری خۆمان ببەینەوە. ئیدی لە سایەی ئەو شپرزەییو شڵەژاوییەدا، کە لە گوشارو فشاری کارەوە سەر دەردەهێنێت، دەبین بە کۆمەڵە ناکەسێك، کەس نابەخشین، ئارامیو خۆگریمان دەبڕێتەوە، هەستی کەسانی دیکە ڕاناگرین، لە ئاستی پێشنیازەکانیشیاندا، خۆ لە نەزانی دەدەینو گوێی خۆمانی لێ دەخەوێنین، هەروەها لە نرخو بەهای دەستکەوتەکانیان کەم دەکەینەوە، لە بەرچاو هاوڕێکانیاندا، سەرکۆنەیان دەکەینو هۆشدارییان پێ دەدەین. بەمەش ئەو ڕێبازە زێڕینە لەبیر دەکەین، کە بڕیاری ناڕاستەکردنی ڕەخنە، بۆ خەتاو هەڵە دەدات، نەك بۆ خەتابارو هەڵەکارەکە.

لەسەرمانە، گوتەی ئەو دانایەمان لەبیر نەچێت، کە دەڵێت: هەر ڕەخنەو گلەییەك، لە کەسانی دی دەیگرین، دەبێت لە بابۆڵەیەکدا دایبنێین، کە بە ستایشو پێداهەلگوتن چەور کرا بێت.

بە گشتی سەرکردە باشەکان، ئەوانەن بایەخدان بە کارمەندو ئیشکەرەکان پیشان دەدەن، بە جۆرێك ڕێنماییەکانیان، بەلێزانیو شتێك لە ڕێزگرتن دەردەکەن.



# کاری کەمو ئەنجامی مەزن

ن: عبدالله العثمان و: جەلال عەبدوڵڵا

## ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە

**٣٦- لێبوردەیی..**

کاتێك لە کەسێك دەبووریت، ئەوەی کە لەسەر شانتە دای دەگریت، خۆتو ئەوانی تریش ئارام دەبنەوەو دەبیت بە خۆشەویستی هەموان، ئەوەی لێبوردە نەبێت؛ ناگات بە توانا شاراوەکانی وەك خۆشەویستیو خێرو بەخشین، ڕقو کینە ڕێگرن لەبەردەم گەیشتن بە خۆشییەکانی ژیاندا. ناتوانین کەسمان خۆش بووێت ئەگەر لێبوردە نەبین، ئەگەر کەسمان خۆش نەوێت ناتوانین ببەخشین، بەخشندەکان لێبوردەنو خۆشەویستانیش دەبەخشن. کەسی لێبوردە خۆشەویستە، لە خۆتو خەڵکی ببوورە، ناتوانیت ئەم هەموو قورساییە هەڵبگریتو بۆ ماوەیەکی درێژ ڕێگە ببڕیت، ئەم بارە قورسە لەسەر شانت دابگرە، ئەگینا لە پەلوپۆت دەخاتو دەکەویت.

**٣٧-گرنگی بەتەندرووستیت بدە..**

گرنگیدان بە تەندرووستیی خۆت، بابەتێکی گرنگە بۆ بەدەستهێنانی کاتو وەبەرهێنانی زۆر، ئەگەر مرۆڤ نەخۆش بکەوێت، بەدڵنیاییەوە کاتێکی زۆری لەدەست دەچێت، وزەیەکی زۆری دەروونیو جەستەیی لێدەڕوات، ئەو کاتەی تێیدا گرنگی دەدەیت بە تەندرووستیت، لە وەرزشو ڕێکردنو پشکنینی پزیشکیو خواردنی تەندرووست، زۆر باشترە لەوەی دواتر کاتێکی زۆر ماندووبیت، کاتێك تەرخان بکە بۆ خۆتو گرنگی بە تەندرووستیی خۆت بدەو سوود لە کاتەکانت وەربگرە.

**٣٨-ئەمڕۆو سبەیکردن..**

یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی بەفیڕۆچوونی کاتو وزە، دواخستنی کارو ئەمڕۆو سبەیکردنە، هەموو کارێکی سەرکەوتوو گرنگ، وا باشترە ئێستا دەست بکەیت بە ئەنجامدانیو بەدەستی بهێنە، نەکەیت دەستی لێ هەڵبگریت، مرۆڤ کار دوا دەخات بۆ دوورکەوتنەوە لە ئازاری کاتی ئەنجامدان، ئازارەکە زۆرتر دەبێت کاتێك دوای دەخەیت؛ چونکە خەمی دواخستنەکەو خەمی کارکردنەکەش هەڵدەگریت، بۆ چارەسەرکردنی دواخستنی کار، هەرئێستا دەست پێ بکە، دواتر کاتت نییە بۆ ئەنجامدانی، ئەگەر ئێستا دەست پێ نەکەیت، یان بڕیار بدە، کارەکە ئەنجام نەدەیت، یان دوای بخە، یان ڕاوێژ بکە.

**٣٩-بیر بکەرەوە چیت دەوێت؟**

بیر بکەرەوە چیت دەوێت، نەك چیت ناوێت، بیر لە چارەسەر بکەرەوە، نەك لە کێشەکان، بیر لە خۆشی بکەرەوە، نەك لە دڵتەنگی، لە خۆت بپرسە: (چۆن)؟، واز بهێنە لە (بۆچی)؟، بەسادەیی بیر بکەرەوە، نەك بە ئاڵۆزی، بیر لە خۆشیهێنەکان بکەرەوە، نەك لە ناخۆشیهێنەکان، بیر لە گونجاو بکەرەوە، نەك لە نەگونجاو، بیر لە ڕووناکی بکەرەوە، نەك لە تاریکی، کاتێك بیر دەکەیتەوە لەوەی کە دەتەوێت؛ ئەوا تۆ بەرەو ئامانج دەردەچیت، ئەوەی دەتوانیت پێشکەشی دەکەیت، واز دەهێنیت لەوەی لە توانای تۆدا نییە، کە چارەسەری بکەیت، دڵنیابە تۆ داهاتوو ڕۆشن دەکەیتەوە، لەجیاتی ئەوەی خەریك بیت بە چاککردنەوەی کارێکەوە کە چارەسەری نییە، هەرکاتێك بیر لەوە بکەیتەوە، کە خۆشحاڵت دەکات، خۆشحاڵ دەبیت، هەرکاتێکیش بیر لەوە بکەیتەوە کە ناتەوێت، ماندوو دەبیت.

**٤٠- یاساکانت ئاسـان بکە.**

هەندێك کەس یاسای زۆر زۆر دادەنێن، بۆ ئەو شتانەی کە دەیانەوێت بەدەستی بهێنن، ئەو هاوڕێیەکی دەوێت باشو بەوەفا بێت، خۆشحاڵو دەوڵەمەند، گەشبینو کەیف خۆش بێت ..هتد. ئەو بەو کارەی خۆی دەڕەنجێنێتو کارەکە لەسەر خۆی قورستر دەکات. یاسای خۆشەویستی دابنێ، ئەوانەت خۆش بوێت، کە خۆشیان دەوێیت، پێویستیت بەم نەریتو یاسا زۆرو قورسانە نییە، یاسای خۆشبەختی، ئاسان بکەرەوە؛ بەچاو کرانەوەت هەست بە خۆشبەختی دەکەیت، هەست دەکەیت لەم جیهانەدا، بوونت هەیە. لە یاساکانی سەرکەوتن: هەست بەسەرکەوتن دەکەیت هەرکاتێك ببەخشیتو بیر لەبەخشین بکەیتەوە، خۆتو ئەوانی تریش خۆشحاڵ دەکەیتو دەبیت بەیەکێك لە کەسە خۆشبەختەکان.




سامان کەریم
بەشی هەشتەم

# پلان
## کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

**پرسیار؟**

بۆچی ڕێگای چێککردنەوەی زانیاریی هاوڵاتیان گرنگە؟واتە: بۆ دەبێت چێکی زانیاریی هاوڵاتیان بکەینەوە؟

وەڵام: لەبەرئەوەی بزانین چەند هاوڵاتی بەهەڵە زانیارییەکانی پڕ کردووەتەوە، ڕاستی بکەینەوە، هەروەها ڕێگە لەناوی دووبارەو خێزانی دووبارە بگرین، واتە: هەر کەسێك ببێت بە خاوەنی یەك ناسنامەی خۆی.

**کرداری جێبەجێکردن**

مەبەستمان لەم کردارانە ئەوەیە، کە هەر یەك لەم خاڵانەی خوارەوە، بۆ سێ ڕێگاکەی پێشوو بەدەست بهێنین کە باسمان لێوە کرد، بەڵام ئەم خاڵانەی خوارەوە کرداری جێبەجێکردنن بۆ سێ ڕێگاکە:

یەکەم: هاوکاری
دووەم: کات
سێیەم: شێوازی کارکردن
چوارەم: کادری پێویست
پێنجەم: بڕی بودجە
شەشەم: ڕاگەیاندن

**یەکەم: هاوکاری**

مەبەستمان چییە لە هاوکاری؟

مەبەستمان پێی بەدەستهێنانی هاوکاری (مادیو مەعنەوییە) لەلایەن حکومەتو هاوڵاتییەوە، بەوەی حکومەت هەموو پێداویستییەکانی جێبەجێکردنی ئەم پلانە دابین بکاتو ڕۆژانە ئاگاداری بەرەوپێشچوونو ئاستەنگەکان بێتو چارەسەری هەموو لایەنەکانی بکات. هاوڵاتیانیش بەدەم پلانەکەوە بێن بۆ سەرخستنی پلانەکە؛ چونکە دواجار ئەم پلانە هەموو هاوڵاتییەك سوودی گەورەی لێ دەبینێت.

**دووەم: کات**

مەبەستمان چییە لە کات؟

مەبەستمان پێی، ئەو کاتەیە کە تەواوی پلانەکەی پێ جێبەجێ دەکرێت، بۆ هەر سێ قۆناغەکەی کە باسمان کرد.

ڕەنگە قورس بێت پێش وەخت کاتەکە دیاری بکەین؛ لەبەرئەوەی نازانین تووشی چ پێش هاتو ڕووبەڕووبوونەوەیەك دەبین؟! بەڵام بەشێوەیەکی خەمڵاندن، ئەم لایەنە گرنگە ڕوون دەکەینەوە بۆ هەر سێ ڕێگای کارکردن؛ تا بزانین بەچەندێك دەتوانین ئەم پلانە جێبەجێ بکەین.

**یەك:** بڕی کات بۆ ڕێگای یەکەم، (ڕێگای پێدانی فۆڕمی زانیاریو پڕکردنەوە)

دیاریکردنی کات بۆ ئەم ڕێگایە، بریتی دەبێت لە (١٥ ڕۆژ بۆ ٣٠ ڕۆژ) کە دەبێت هەموو سەرۆك خێزانێك دوای ئەوەی فۆڕم بۆ خۆیو ئەندامانی خێزانەکەی لە وێستگەی شوێنی نیشتەجێبوونی وەردەگرێت لەو ماوەیەدا بەهەموو زانیاریو داواکراوەکانەوە بیگێڕێتەوە بۆ شوێنی مەبەست، هەرچەندە ماوەکە کەمێك زۆرە بەوەی کە ئەو پێداویستیو زانیارییانە لە (٧ ڕۆژ بۆ ١٥ ڕۆژ)ی بەسە، بەڵام تا ڕێژەی هەڵە سفر بێتو هەموو پێداویستییەکانیش بتوانێت دابین بکات لەو ماوەیەدا؛ لەبەرئەوەی هەر هەڵەیەك لە زانیاریو پێداویستی هەبوو؛ چارەسەر بکرێت.

**دوو:** بڕی کات بۆ ڕێگای دووەم (ڕێگای پشکنینی زانیاریو پێداویستیی هاوڵاتیان)

دوای ئەوەی هەموو سەرۆکخێزانێك لەو ماوە دیاریکراوەدا، زانیارییەکانی گێڕایەوە، ئینجا ئەم ڕێگایە دەست پێ دەکەین؛ بۆئەوەی ڕاستیو دروستی زانیارییەکانمان بۆ دەرکەوێت؛ چونکە ئامار لەسەر بنەمای درۆ بنیات نانرێت.

ئەم کردارەش، کردارێکی مەیدانییەو لەڕێگای وێستگە دیاریکراوەکانەوە دەکرێت، بەوەی لەسەر نەخشەی ئەو شوێنی نیشتەجێبوونە ماڵ بە ماڵ کردارەکە لە یەك کاتدا هەموو وێستەگەکانی پارێزگا پێی هەڵدەستن، هەر ئەندامێکی خێزانیش لەماڵ نەبوو، لەو ڕۆژەدا دواتر لەشوێنی کارەکەی بەراودکاری زانیارییەکانی دەکرێت، یان دەبێت بچێت بۆ وێستگەکە بۆ ڕاستیو دروستی زانیارییەکانی

## ڕوونکردنەوەی گرنگ لەسەر کات، بۆ ئەم ڕێگایە:

ئەم کاتە قورسە بە خەملاندنیش دیاری بکرێت؛ چونکە وەك وتم نازانین تووشی چ پێشهاتێك دەبین، کاتیش بۆ ئەم ڕێگایە لەچەند حاڵەتێکدا دەردەکەوێت، کە چەندمان کات بۆ ئەم ڕێگایە پێویستە، لەوانە: فەرەباڵغی ناوچەی نیشتەجێبوون سەرەکیترین هۆکاری دیاریکردنی بڕی کاتەکەیە.

خێرایی کارمەندان، ئەم کاتە بۆ ڕێژەیەکی باش کەم دەکاتەوە، گەر بتوانین هەر وێستگەیەك شەفتی ئیشکردنی شەوانیشی هەبێت، کارەکەمان دوو هێندە خێراتر دەکات. واتە: تا کارمەند لێهاتووترو دڵسۆزتر کار بکات، پلانەکەمان خێراتر بەئەنجام دەگات.

ڕاستگۆیی هاوڵاتیان لەپڕکردنەوەی زانیارییەکاندا هۆکارێکی باش دەبێت؛ بۆئەوەی بە کەمترین ماوە ئەم ڕێگایە ببڕین. لەبەرئەوەی کرداری چێککردنەوەی زانیارییەکان کەمتری پێ دەچێت بۆیە کاتی تێچووش کەمتر دەبێتەوە.

ناوچەکانی نیشتەجێبوون، جیاوازی دەخاتە جێبەجێکردنی ئەم ڕێگایە بۆ کاتی خەمڵێنراو، واتە: ناوچەی نیشتەجێبوونی چڕ، جیاوازە لەگەڵ ناوچەی نیشتەجێبوونی کەمدا.

هەندێك پشکنین هەیە، تایبەتە بە سەرۆکخێزانەوە وەك خاوەنی خانووی خۆی بێت، یان کرێچی، هەندێك پشکنین هەیە تایبەتە بە هەموو ئەندامانی خێزانەوە، بە سەرۆکی خێزانیشەوە، وەك پیشەو شوێنی پیشە، مووچە، بۆ دیاریکردنی ئاستی ژیانی ئەو خێزانە، کە کاردەکاتە سەر ڕاستیو درووستی ئامارەکەمان. واتە: هەندێك تایبەتمەندی بۆ سەرۆك خێزانە، هەندێکی تر بۆ ئەندامانی خێزانە، لەبەر بەرپرسیارێتی.

هەرکەسێك دەرکەوت بە ئەنقەست، هەر یەك لەو زانیاریانەی کە دیگێرێتەوە، بەهەڵە پڕ کردبووەوە؛ ئەوا تاکوو زانیاریی ڕاست نەهێنێت، دەبێت لە مافی هاوڵاتیبوون بێبەش بکرێت، واتە: نابێتە خاوەنی ناسنامەکە، ئەمەش زۆر ئاسان دەکرێت. یان لە داهاتوودا درۆیەکی لە زانیارییەکاندا بە ئەنقەست کرد، دەتوانرێت سزا بدرێت؛ بۆئەوەی کەس ئەو کارە نەکات.

گرنگترین خاڵ، بریتییە لەوەی کە دەبێت نەخشەی نیشتەجێبوونی هەر ناوچەیەك بدرێت بەو وێستگانەی کە لە ڕێگای یەکەمو دووەم کار دەکەن، لەڕێگای شارەوانییەوە؛ بۆئەوەی بەپێی نەخشەکە، کارمەندەکان بزانن چەند ماڵ لەو شوێنە هەیەو بەپێی نەخشەکە ڕێژەی سەدی، تەواوکاری ماڵەکان بکەن. گەر هەر شوێنێك نەخشەکەی نەبوو، دەبێت نەخشەکەی بۆ درووست بکرێت.

سێ: بڕی کات بۆ ڕێگای سێیەم (ڕێگای داخڵکردنی زانیارییەکانو درووستکردنی ئامارەکە)

دوای ڕێگای پشکنین، واتە: دوای ئەوەی هەموو زانیارییەکان ئامادە دەبن؛ بۆئەوەی ئامارەکە درووست بکەین، ئینجا ئەم ڕێگایە دەست پێ دەکەین، کە گرنگترین ڕێگایە؛ چونکە بەهێزی ئامارەکە لەم ڕێگایەدا دەردەکەوێت.

ئەم کردارەش بە کەسانی شارەزاو پسپۆڕ لەو بەرنامە تەکنەلۆجیەدا دەکرێت، کە لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێ کردو پلانەکەی پێ جێبەجێ دەکەین، کاتی ئەم ڕێگایەش لێهاتوویی‌و خێرایی ئەو کەسانە دیاری دەکات، کە ئەمەیان دەتوانین بەشێوەیەکی خەملاندن، کاتەکەی دیاری بکەین.

## چۆنێتیی دیاریکردنی ماوەی دیاریکراو بۆ ڕێگای سێیەم

بۆ ئەم ڕێگایە، دوو خاڵ دەبنە هۆی دیاریکردنی کاتی دیاریکراو:

ژمارەی کارمەند

لێهاتوویی‌و خێرایی کارمەندەکان

بۆ نموونە: گەر بۆ ئەم پلانە، (١٠٠٠) کارمەندمان هەبێت، بۆ هەر سێ پارێزگاکە، بۆ درووستکردنی ئامارەکەو ڕۆژانە هەر کارمەندێك بتوانێت (٥) خێزان تەواو بکات بە هەموو ئەندامەکانییەوە، ئەوا بۆ هەر ڕۆژێك (٥٠٠٠) هەزار خێزان تەواو دەکەین، گەر دانیشتوانی هەرێمی کوردستان بریتی بێت لە یەك ملیۆن خێزان؛ ئەوا هەموو دانیشتووانی هەرێم، بە (٢٠٠) ڕۆژ تەواو دەبێت، بە هەموو ئەندامەکانییەوە، بەبێ بوونی هیچ پشوویەك لەو ماوەیەدا. واتە: بەشێوەیەکی بەردەوام، بەڵام ئەم بەردەوامییە ڕوو نادات؛ چونکە ڕۆژانە ڕووداوی نەخوازراوو پشوو، شتی تر ڕوو دەدات. بۆیە ماوەکەی زیاتر لەم ماوەیەی پێ دەچێت کە (٢٠٠) ڕۆژە.

تێبینی /

کەدەڵێین (٢٠٠) ڕۆژ. واتە: بەو شێوازەی کە ئاماژەمان بۆ کرد، واتە: بە (١٠٠٠) کارمەندو ڕۆژانە (٥) خێزان، مانای ئەوەی گەر ژمارەی کارمەند زیاد بکەین‌و ڕۆژانە خێزانی زیاتر داخڵ بکرێت؛ ئەوا ماوەکە کەم دەبێتەوە، یان گەر هەر کارمەندێك ڕۆژانە بتوانێت (١٠) خێزان تەواو بکات، ئەوا کاتەکە دوو هێندە کەم دەبێتەوە، واتە: ماوەکە ژمارەو خێرایی کارمەندەکە دیاریی دەکات.

گەر دانیشتوانی هەرێم لەو ڕێژەی خێزانەی کە دامان نا، کەمتر بێت لەو کاتە دیاریکراوە کەمتری پێ دەچێت، گەر زیاتر بوو لەو کاتە زیاتری پێ دەچێت. واتە: ژمارەی خێزانیش دەوری خۆی دەبینێت، لە دیاریکردنی کاتەکەدا.

دەبێت شێوازی گرێبەست، یان دامەزراندنی ئەم کارمەندانە بەجۆرێك بێت، کە پشوویەکی کەم بیانگرێتەوە، تەنها ئەو ڕووداوانەش بیانگرێتەوە، کە پێویست بن؛ بۆئەوەی بە کەمترین ماوە، ئەم پلانە جێبەجێ بکەین.

کەواتە: دەتوانین بڵێین بەهەر سێ ڕێگاکەو بە شێوەیەکی خەملاندن کاتی دیاریکراو، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانە بەنزیکەیی، ساڵێك بۆ ساڵو نیوێکی دەوێت، کە ڕەنگە زیاتر، یان کەمتر لەو ماوەیەشی پێ بچێت.

## مەبەستمان چییە لە شێوازی کارکردن؟

مەبەستمان پێی ئەوەیە، بە چ شێوازێکی کارکردن کاربکەین بۆ هەر سێ ڕێگاکە، بۆ سەرکەوتنی پلانەکە. ئەم شێوازی کارکردنە دەکرێت بە دوو قۆناغ:



# خۆت ژمێریاری خۆت بە!

بەشی سێیەم

حامید حسێن

### چۆن بەهۆشمەندیی بازرگانی، سوودی سەرمایە باشتر بکەین؟

لە ژمارەی پێشووی بڕیاردا، باسی هۆشمەندیی پلانو بەرنامەی فڕۆکەوانو گەیشتن بە ئامانج کرا، وردەکاری ئەم پلانەش، لەگەڵ پلانی بازرگانیدا بەراورد کراو ئاماژەمان بە شەش خاڵ کرد، کە ڕوونکردنەوەو شیکاری ئەو شەش خاڵە، لەخوارەوە دەخەینە ڕوو.

### فڕۆکەوان چۆن سەرکەوتوو دەبێت؟

بە ڕەچاوکردنو جێبەجێکردنی شەش خاڵی بگۆڕی قەیرانەکان، دەتوانیت ئەم سەرکەوتنە، لە کارو کەسابەت دا وێنا بکەیت:

**١- ڕوونو شەفافبوونی خاڵی دەسپێك:** فڕۆکەوان بەڕوونی دەزانێت، خاڵی سەرەتای فڕینی لە چ شارێکەو بارودۆخی ئێستای بۆ ڕوونو ئاشکرایە، وەك واقیعی دۆخەکە، نەك ئەوەی خۆیو یارمەتیدەرەکانی بیانەوێت.

**٢- ئامانجی دیارو شوێنی مەبەست:** فڕۆکەوان ناتوانێت لە شوێنێکی هەڕەمەکی بنیشێتەوەو بڵێ: ئەمە شوێنی مەبەستە. ئەو لە مەودای ڕێگادا، دەبێت بڕیاری پێویست بدات؛ تا بگاتە شوێنێك کە پێشتر بۆی دیاری کراوە. هەر بەم شێوەیەش، پێویستە هۆشمەندیی بازرگانی، ئامڕازێك بێت بۆ گەیشتن بە ئامانجو ڕۆیشتن بەرەو ئاڕاستەی ئامانجو ستراتیژییەتەکان، نەك وەکوو یەك ئامێری جیاو تەنها بە ناو تەکنەلۆژی بێتو پەراوێز بخرێت.

**٣- هەبوونی پلانو بەرنامە:** فڕۆکەوان، هەتا بەرنامەیەکی فڕینی ڕوونی نەبێت؛ نافڕێت. ئەم نەخشەیە، یارمەتیی دەدات، کە چۆن لە دەسپێکەوە، بگات بە ئامانج. هەروەها هۆشمەندیی بازرگانی، پێویستە وەك ئامڕازێك بێت؛ تا نەخشەڕێی دەسپێکی ئەمڕۆو شوێنی مەبەست، کە پێویستە لە داهاتوودا پێی بگات، نیشان بدات.

**٤- توانای گۆڕانکاریی پێویست:** فڕۆکەوان دەزانێت، کە لە ٩٥٪ی کاتەکان، لە ڕێ لا دەدات. چاوەڕێی ناجێگیربوون بە بەراوردی ڕێگا دەکاتو بەربەرەکانی لەگەڵدا دەکات. هەر بەم شێوەیە، بەڕێوەبەرەکان پێویستە پێشبینیی گۆڕانکارییەکان بکەن.

**٥- توانای بەرپەرچدانەوەی خێرا:** کاتێك یەك پلە، لا دەدەیتو خێرا ڕاستی دەکەیتەوە، لەوانەیە زیاتر لە یەك میل ڕێگای درێژتر نەپێویت، بەڵام ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژ، فڕۆکەکە هەروا بڕوات، خێرا سەدان میل لە ئاڕاستەی سەرەکی لا دەدات. فڕۆکەوان کابینەیەکی پڕئامێری لەبەردەستە، کە پێی دەڵێن، لە کوێی ڕێدایەو دەبێت بەرەو کوێ بچێتو هەموو کات ئاگاداری بارودۆخەکەیە.

بەم شێوەیە، هۆشمەندیی بازرگانی، پێویستە هێمای ئاگادارکردنەوەو وێنەیەك لە ڕێگات نیشان بدات، بۆ نموونە: خشتەیەکی هێڵکاری بەپێی کات.

**٦- توانای بەرپەرچدانەوەی بەردەوام:** فڕۆکەوان بەردەوامو لە هەر خولەکێکدا، ڕێی بەرەوپێشچوون ڕاست دەکاتەوە. ئەو بۆی نییە، کە کاتژمێرێك بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە دەبێت چی بکات، کات بەفیڕۆ بدات. ئەم حاڵەتە لەگەڵ کارو کەسابەتی ئاسایی بەراورد بکە، یەك مانگ تێپەڕ ببێتو پاش چەند هەفتەش ڕاپۆرتە داراییەکان ئامادە بکرێن، تازە ئەو کات بەڕێوەبەرەکان پێ بزانن، کە بارودۆخی ئیشو کار بە چ شێوەیەکە، هەروەها لە باشترینی ئەم حاڵەتەدا، ١٢ جار هەلی ڕاستکردنەوەی ڕێگا لە ماوەی ساڵدا هەیە. هەرچی بەرزونزمیو ناجێگیرییەکان لە کاردا بەدی بکرێت؛ پێویست بە ڕاستکردنەوەی بەردەوامی ڕێگای چارەنووسساز هەیە. لەوانەیە بتوانین بڵێین کە گرنگترین سەرنجی یەك ڕێکاری هۆشمەندیی بازرگانی، دەبێت لەسەر ڕاستکردنەوەی بەردەوامو پێشبینی داهاتووی ڕێگا بێت.

بەم شەش تایبەتمەندییەی سەرەوە، دەتوانیت چاوەڕێ بکەیت ڕێکاری هۆشمەندیی بازرگانی، بەهایەکی گونجاو بەردەست بخاتو سوودی سەرمایەدانانی سەرەتایی، گەرەنتی بکات، ئەم بارودۆخە ویستراوە هەمان یارمەتیدانە بۆ بەڕێوەبەرەکان، بۆ ڕێنمایی فڕۆکەی کارو کەسابەتیان، بۆ گەیشتن بە ئامانجی نزیكو دوور کە خواستیانە.

و: لە فارسیەوە: Harvard Business Review

وەهاب حەسیب محەمەد
بینگول/ ترکیا



# بەڕێوەبەری سەرکەوتوو کێیە؟

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. ئەو کەسەیە پشت بە زانینو زانیاری دەبەستێت، نەك بە لێهاتوویی.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. ئەو کەسەیە پشت نابەستێت بە هەل، بەڵکوو پشتئەستووره بە پلانو تەگبیر. بۆیە دەگوترێت: بەڕێوەبردن پیشەیەکە، بێجگە لە بەڕێوەبردن پیشەیەکی دیکە نییە.

ڕەنگە بۆ ئێرەو تائێرە، ئەم وتەیە ڕاست بێت، بەڵام بۆ بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، کارێکی نەشیاوە!

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. بە تەنها خاوەن دەسەڵاتو بڕیارو وتەی کۆتایی، نییە! بەڵکوو خاوەن کۆمەڵێك کەسی شارەزایە، کە لە بەشێك لە کاری ڕێکخراوەکەدا، پیشتیان پێ دەبەستێت. ئەو بەرپرسە لە دەرکردنی بڕیارو جێبەجێکردنی، بە هەمان شێوە چاودێریکردنی کارەکانیش، هەر لە ئەستۆی ئەودایە.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. ڕێکخەرو ئاسانکارە، پشتو پەنای ئەو تیپەیە، کە لە تەکیدا کار دەکەن، بێئەوەی ببێت بە چەقی کارەکان، یان کۆی بڕیارەکان لە دەستیدا گرد بکاتەوە.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. کەسێك نییە بە تەنها لە پیشەکەیدا پسپۆڕ بێت! کەسێکی شارەزاو دانایە بە زۆر زانستو زانیاریی جۆراوجۆر، ئەو شارەزایە بە هاوکاری لە مامەڵەکردن، لەتەك کۆمەڵێك پسپۆڕو شارەزادا، لە کێشەو ئاریشەکان تێ دەگاتو دەتوانێت پشتئەستور بە شێوازی زانستییانە تێڕامانو شیکاری، لەتەك شارەزاو پسپۆڕاندا هەڵبکات.

مەرج نییە بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، لەو ڕێکخراوەوە کە تێیدا کاری کردووە دەربکەوێتو هەڵبکەوێت، چون ئەو خاوەن شارەزاییو لێهاتووییە، لە هەر ڕێکخراوێکی دیکەوە هاتبێت، ئەو مەشخەڵو سونبولە؛ چونکی خاوەن زانینو زانیاریی پێویستە.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. لە ناوەندێکی بچکۆلانەدا بۆ کۆکردنەوەی زانستو زانیاریی پێویستی بە ساڵانێك شەنوکەو نییە؛ چونکی هۆکارەکانی فێربوون لە ماوەیەکی کەمو بە کۆششێکی کەمتر، گەنجینەیەکی گەورەی فێربوونی دەخەنە بەردەست.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.. پێویستی بە گەڕانو کێومالکردن نییە؛ چونکی تەکنەلۆژیای سەردەم، گشت دنیا لە نووسینگەکەیدا کۆ دەکاتەوە، بە هەمان شێوە، لەم دنیا پانو بەرینەدا، ئەویش دەباتە هەموو نووسینگەیەکەوە.

گرنگترین زانست بۆ بەڕێوەبەری سەرکەوتوو بریتییە لە: زانستە مرۆڤایەتییەکان، بنەماکانی مامەڵەکردن لەتەك سەرچاوەی مرۆییدا، لێهاتوویی‌و پەیوەندیکردن بە یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی بەڕێوبەری سەرکەوتوو دادەنرێت.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، هەمیشە پەیوەندی لەتەك تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو سەردەمییانەدا هەیە، بە هیوای جۆراوجۆرکردنی چالاکییەکان، دەرکەوتنی ئاسۆی نوێو بە مەبەستی گەیشتن بە بازاڕی تازە، دۆزینەوەی کڕیاری نوێ، هەمیشە گرنگی دەدات، بە توێژینەوەی بوارە نوێیەکان.



# نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازارسازیی ڕایەڵەدا
# (نێتۆرك مارکێتینگ)

و: ئانا هەورامی

بەشی شەشەم

## سەرکەوتن، یان شکست لە ۹۰ ڕۆژی یەکەمدا
## چەمکە پەیوەندیدارەکان بە نێتۆرکی مارکێتینگ

### کۆبوونەوەی ناساندن

زۆر کات، کەسانی سەرەوە، کۆبوونەوەیەکی ناساندنت بۆ ڕێك دەخەن؛ هەتا تۆ بە بازرگانی NM ئاشنا بکەن. ئەم کۆبوونەوەیە، زۆرجار لەم بابەتانەی خوارەوە پێکهاتووە:

١- شێوازی کارکردنی کۆمپانیا.

٢-شێوازی دانەوەی قەرز.

٣-زانیاریگەلی پێویست، لەبارەی بەرهەمەکانی کۆمپانیاوە.

٤-ئامێرە پێویستەکان، بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

٥-دیاریکردنی ئامانج.

٦-شێوازی بانگهێشت.

٧-شێوازی وەڵامدانەوەی پرسیارو بیانووە بڵاوەکان.

لە بەشەکانی دواتردا، لەبارەی ئەم بابەتانەوە زیاتر قسە دەکەین.

### پێویستییەکانی کار

ڕێك وەك هەر بازرگانییەکی تر، بۆ دەستپێکردنی بنچینەی ئەم بازرگانییە، چەند پێویستییەکت هەیە. ڕێنماییەکانی خوارەوە، دەتوانن لەم زەمینەیەدا، یارمەتیت بدەن:

١- ئەم بارزگانییە، بارزگانییەکی ماڵییەو لەبەر ئەم هۆیە دەبێت لە ماڵەوە کار بکەیت. بۆ ئەمەش پێویستە نووسینگەی کارت لە ماڵەوە دابمەزرێنیت. بۆ ئەم کارەش مێزو کورسییەك لەگەڵ هێڵێکی تەلەفۆن بەسە. هەڵبەتە گەر بتوانیت دەزگایەکی فاکس، تەلەفۆنێکی پەیامگیرو دەزگایەکی کۆمپیوتەریش ئامادە بکەیت، سوود مەند دەبێت.

٢-پێشوەخت بابەتە فێرکارییەکانی وەکوو کتێب، نامیلکە، کاسێتو CDو شتی تر، لە بەرپرسە باڵادەستییەکانت وەربگرە.

٣- تەلەفۆنی مۆبایل، بە تایبەت ئەگەر هەمو کەسەکان سوودی لێ وەربگرن، کارێکی باشە. NM بازرگانیی پەیوەندییەکانەو هەر بەم هۆیەوە، ئەگەر تەلەفۆنی مۆبایلتان نەبێت؛ زیانمەند دەبن.

### بنەما ئەخلاقییەکان

NM بازرگانییەکە، لەسەر هەمو لایەنە ئەخلاقییەکان بونیاد نراوە. لەبەرئەوە گرنگە هەموو کارەکەت بە ئەخلاقیترین شێوە ئەنجام بدەیتو کەشی هاوڕێیەتیو درووستکاری بۆ کۆمەڵەکانی خوار خۆت بگوازیتەوە. ئەگەر کارەکەت بە پرۆفیشناڵترینو ئەخلاقیترین شێوازی گونجاو ئەنجام بدەیت، دەبیت بە جێگای ستایشو ڕێزی هاوکارەکانت. لەم زەمینەیەدا، لەم ڕێنموونییانەی خوارەوە سوودمەند دەبیت:

#### ١- کارێك بۆ خودی خۆت

هەمیشە لەبیرت بێت، کە تۆ بۆ خۆتان کار دەکەیت. تۆ بۆ هاوبەشەکەت، یان باڵادەستەکانت کار ناکەیت. ئێوە تەنها بۆ خۆت چالاکی دەکەیتو هەر بەم هۆیەوە، بەرپرسی سەرکەوتن، یان شکستهێنانت، خۆت دەبیت.

#### ٢-بنەمای زێڕین: "ئەوەی کە بۆ خۆت پەسەندی ناکەیت، بۆ

کەسانی تریش پەسەندی مەکە".

ئەگەر پێت خۆش نییە، بکەویتە بەر ڕەخنەو سەرزەنشتەوە، ناتەواویی کەسانی تر ئاشکرا مەکەو سەرزەنشتیان مەکە. زۆربەی ڕێنماییەکانی تر، لە پەیوەندییە نزیکەکاندا لەگەڵ ئەمەدا، یەك بنەمان.

### ٣- بڕیار بەسەر کەسانی تردا مەدە

ئەم کارە کۆمپانیاکانی ترو بەرهەمەکانیان، شێوازی دانەوەی قەرزەکانیان، کڕیارەکانیشیان دەگرێتەوە. هەمیشە جەخت لە پشکی کۆمپانیای خۆت، بەرهەمەکانی، شێوازی دانەوەی قەرزەکانیو گرووپەکەتان بکەنەوە، بەڵام لەبارەی ئەوانی تریشەوە، خراپە مەڵێ. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ببنە جێگای ڕێزی کەسانی تر.

## بەڵێن

سەرکەوتنت، بەندە بە بەڵێنەکانتەوە لە بازرگانییەکەتدا. هەرچی جددیترو خاوەن بەڵێنتر بیت، دەستت بە سەرکەوتنی زیاتر دەگات. بەڵێنەکانی تۆ، ئەم بابەتانەی خوارەوە دەگرنەوە:

### ١- پارە

پێویستە بۆ بابەتەکانی خوارەوە بڕێك خەرج بکەن:

-بابەتی فێرکاری، وەکوو کاسێت، CD، کتێب، پێویستی نووسینو شتی تر...

-پێویستییەکانی دەستپێکردنی کار کە پێشتر باس کرا.

-خەرجگەلی تایبەت بە هاتوچۆ.

-خەرجی بەشدارکردن لە سیمینارو کۆڕەکاندا.

### ٢- کات

ئەگەر پێت خۆشە لەم کارەدا سەرکەوتو بیت، پێویستە لانی کەم هەفتەی، ٢٤ کاتژمێر تایبەت بکەیت بەم کارەوە. ئەم چەند کاتژمێرەی کە لە هەفتەدا خەرجی ئەم کارەی دەکەیت، یارمەتیت دەدات هەتا "هێڵی لوولەیی" دروووست بکەیتو بە دەرامەتی هەمیشەییو چالاك بگەن. بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان خۆشە بە خێراییەکی زۆرتر چالاکی بکەن، پێویستە کاتێکی زۆرتر دابنێیت. ئەم تەرخانکردنی کاتە، تەنها لە قۆناغە سەرەتاییەکانی کارەکەتدا، بەم شێوەیەیەو هەر کە کۆمەڵەکەت بە گەشەی پێویست بگات، پێویستت بە تەرخانکردنی کاتێکی کەمترە.

کامڵکردنی بەڵێننامەکەی خوارەوە، بە ناونیشانی پەیمانێك بە خۆت، دەتوانێت سوودمەند بێت:

## بەڵێننامە

من (..........)بەمەبەستی بونیادنانی کۆمەڵەیەکی سەرکەوتوو لە NMو فەراهەمکردنی ئایندەیەکی ڕوونو دڵنیا بۆ خۆمو (.........) بەڵێن دەدەم کە پابەند بم بە بابەتەکانی خوارەوە:

أ. لە هەفتەیەکدا، لانی کەم ٢٤ کاتژمێر، کات تایبەت دەکەم بەم کارەوە.

ب. ڕۆژانە ماوەیەك تایبەت دەکەم بە بەهێزکردنی خۆمەوە (لە ڕێگەی جەختکردنەوە لەسەر خود، خوێندنەوە، ...)

پ. زەینم لە بیرکردنەوەو کاریگەرییە نێگەتیڤەکان دوور دەخەمەوە.

ت. لە ٦ مانگی یەکەمی کارەکەمدا، چاوم لە کۆکردنەوەی ئەزموون دەبێت. من لانی کەم ساڵێك دادەنێم بۆ بونیادنانی کۆمەڵەکەمو پاشان کارەکەم دەخەمڵێنم. ئەوە قەبووڵ دەکەم کە بەرپرسیارێتیی ئەو کەسانەی کە دەیانناسێنم بە کارەکە، لە ئەستۆی مندایە. یەکەم بەرپرسیارێتیی من ئەوەیە، کە خۆم بە سەرکەوتن بگەمو بە کەسانی کۆمەڵەکەشم بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، کۆمەك بکەم. من ڕاستگۆیانەو بە جددییەتێکی تەواو، لە سیستەمو پێشەنگەکانم، پەیڕەوی دەکەم، هەتا کۆششەکانم هاوشێوە بن.

واژۆ------------------ بەروار-------------------

شاهیدی یەکەم---------- بەروار -----------------

شاهیدی دووەم----------- بەروار------------------

لەم لاپەڕەیە نوسخەیەك ئامادە بکەنو بیدەن بە باڵادەستییەکەتان.

### ٣-لە خۆبوردوویی

بۆ سەرکەوتن پێویستە لە هەندێك لەو چالاکییانەی کە پێت خۆشە، لێ بگەڕێیت. پێویستە لە قۆناغەکانی سەرەتای کاردا، کاتە ئازادەکانت تایبەت بکەیت بەم کارەوە. ناچارن ئەو کاتانەی کە لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن، یاریی تۆپی پێ، ڕاوەماسی، دەرەوەی ماڵدا بەسەری دەبەیت، کەمی بکەیتەوەو خەریکی کارەکە بن. تەنانەت لەوانەیە- بەتایبەت لە قۆناغەکانی سەرەتای کارەکەدا- ناچاربیت کاتێکی کەمتر لەگەڵ خانەوادەکەتاندا بەسەر بەرن. لە کۆنەوە گوتوویانە: "بەبێ ڕەنج، ناگەیتە گەنج." لەبەرئەوە بڕیار لە دەستی ئێوەدایە. دەتوانن ئێستا لە ئاسودەییدا بنو باقی تەمەنتان لە ناڕەحەتیدا بەسەر ببەن.

## بیرخستنەوە

لەم باسوخواسەدا، کاری زۆر دێتە پێشەوە، کە جێگای گاڵتە پێکردنو ڕەخنەی کەسانی ترە. هیچ کەسێك لەم یاسایە بەدەر نییە. تەنانەت پێشەنگە سەرکەوتووەکانیش لە ئازاری ئەم گاڵتەپێکردنو توانجانە پارێزراو نین. ئەم کارە بەشێکە لە نێتۆرکی مارکێتینگ. لەبەرئەوە، گاڵتە پێکردنو "نا"بیستن تایبەت نییە بە NM. ئەم جۆری دەربڕینی بۆچوونە نێگەتیڤانە، لەوانەیە لە هەرکارێکی تری ژیانتدا ببینن. لەبەرئەوە، لەبەرامبەر ئەم کارەدا بووەستەو بە بابەتێکی تایبەتی سەیری مەکە. ئەم جۆرە کەسانە، "نا"ت پێ نالێن، بەڵکوو بە هەڵێك"نا" دەڵێن کە دەتوانێت ژیانیان زۆر باشتر بکات. لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا، نیگەران، یان تووڕەمەبە. دڵت بسووتێت بۆ حاڵییان هەتا نەکەویتە ژێر کاریگەرییانەوە. لەبیرت بێت خەونی ئێوە، لە خۆتانەوەیە.هیچ کات ڕێگە مەدەن، کەسانی تر خەونەکانت لێ بدزن!




# سەرەنجامی دووڕوویی

پەیام

لە دێرزەماندا، تووتیەك لە نێو دارستانێكی پڕ لە باڵندەی جوانو نەخشینو دەنگخۆش، ژیانی دەگوزەراند، تووتییەكە لەسەر درەختێكی گەورەی دارستانەكە، هێلانەی درووست كردبوو، لەسەر هەمان درەخت، هێلانەی مام كۆترو چۆلەكە پاساریشی لێ بوو.

ڕۆژێكیان تووتییەكە، سەردانی ماڵی چۆلەكە پاساری كردو لەبارەی مام كۆترەوە قسەی بۆ كرد، بە چۆلەكەی گوت: مام كۆتر، باڵندەیەكی لە خۆبایییە، لەبەرئەوە نامەوێت لەگەڵ كۆتردا ژیان بگوزەرێنیم، دەنگێكی ناخۆشی هەیەو ناهێڵێت بەشەو پشوو بدەمو بە ئارامی بخەوم.

چۆلەكەكە گوتی: بەڵام كۆتر باڵندەیەكی خۆشەویستە لای هەموان، هیچ كات نەبووەتە مایەی بێزاری بۆ دراوسێكانی!

تووتی گوتی: بەڵام من ڕۆژێكیان گوێم لێ بوو، كۆتر دەیگوت: چۆلەكە باڵندەیەكی بچكۆلانەیەو هیچ سوودێكی نییە! دەنگێكی بێزاركەری هەیەو پێویستە پلانێك دابنێین؛ تا لەسەر درەختەكە دەریان بكەین!

بەبیستنی ئەم قسانە، چۆلەكە پاساری زۆر تووڕەبوو، كەوتە بیركردنەوە؛ بۆئەوەی پلانێك دابنێ، تا كۆترەكە دەربكات!

پاش ئەم وتوێژە، تووتی دای لە شەقەی باڵو ڕۆیشت بۆ ماڵی كۆترەكە، پێی گوت: چۆلەكە پاسارییەكان هێلانەی زۆریان لەسەر درەختەكە كردووە، خەریكە تەواوی درەختەكەمان لێ داگیر بكەن!

كۆترەكە گوتی: بەڵام چۆلەكە پاسارییەكان، باڵندەیەكی ڕێكوپێكو بێزیانن.

تووتییەكە گوتی: بەڵام من گوێم لە چۆلەكە پاساری بوو، كە دەیگوت: كۆترەكان باڵندەیەكی بێزاركەرنو هێلانەكانیان گەورەنو پێویستە ئەوان دەربكەین.. كۆترەكە بە بیستنی ئەم قسانە، زۆر تووڕەبوو، بڕیاری دا كە چۆلەكە پاساری لە هێلانەكەی خۆی دەربكات.

ڕۆژێك هەموو باڵندەكان كۆبوونەوە، كۆترەكان بە چۆلەكەكانیان گوت: ئێوە زۆر خراپن، نامانەوێت لەمەودوا ئێوە لەگەڵ ئێمەدا بژین، چۆلەكەكان وەڵامیان دانەوەو گوتیان: ئێوە خراپترین باڵندەی دارستانن؛ چونكە ئێوە دەتانەوێت، ئێمە لە ماڵەكانی خۆمان دەربكەنو هێلانەكانمان تێك بدەن!

لەو لاوە تووتییە دووڕووەكە، زۆر بە خۆشحاڵییەوە سەیری دیمەنەكەی دەكرد!

لەو كاتەدا چۆلەكە پاساری گوتی: تووتی بە ئێمەی گوت: كە ئێوە ئێمەتان خۆشناوێت!

كۆترەكە بەبیستنی ئەم قسەیە سەرسام بوو، وەڵامی دایەوەو گوتی: خۆ تووتی بە ئێمەی گوت: كە چۆلەكەكان دەیانەوێت دەرتان بكەنو ماڵەكانتان داگیربكەن!

كۆترو چۆلەكە ئاوڕیان دایەوە بۆلای تووتییەكەو كەمێك تێرامان بیریان لە قسەكانی توتی كردەوە!

تووتییەكە بە گڵدۆ گڵدۆ گوتی: من.. من.. نانا من هیچم نەگوتووە! ئەو كات كۆترەكانو چۆلەكەكان، بۆیان دەركەوت كە تووتییەكە دەیەوێت بەشەڕیان بداتو نێوانیان تێك بدات! چونكە تووتییەكە باڵندەیەكی دووڕوو بوو، حەزی بە كێشەو ئاژاوەی نێوان دراوسێكانی دەكرد!

هەردووكیان پێكەوە پەلاماری تووتیی دووڕوویان داو لە درەختەكە وەدەریان ناو، هێلانەكەیان تێك دا!

ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، كۆترو چۆلەكە پێكەوە بەئاسوودەییو دوور لە ناخۆشی، بە ئارامی ژیانیان پێكەوە بەسەر دەبرد!

كۆترو چۆلەكە، ژیرانە بیریان كردەوە، پێش ئەوەی بە قسەی تووتی دووڕوو بكەونە گیانی یەكتری، توانییان حەكیمانە، دەستە خراپو ئاژاوەگێڕەكەی نێوانیان دوور بخەنەوە!

منداڵە چاوگەشەكان، هیوادارم ئێوەش لەم چیرۆكە پەند وەرگرن، هەر كات هاوڕێیەكتان ویستی نێوان تۆو هاوڕێكەت تێك بدات، سەرەتا بڕۆ بۆ لای هاوڕێكەتو لە ڕاستو درووستی قسەكان بكۆڵەرەوە، نەكەی هەرگیز بە قسەی ناحەز فریو بخۆیتو خۆت دوچاری دەردەسەریو ئاژاوەو ناڕەحەتی بكەیت!



# نەخۆشی ئایدز (AIDS)

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی




١. بڵاویی نەخۆشیی ئایدز:

توێژینەوەکان دەری دەخەن:

* ژمارەی ئەو کەسانەی هەڵگری ڤایرۆسی (HIV)ن لە جیهاندا، گەشتووەتە زیاد لە (٣٤ ملیۆن) کەسو ساڵانە نزیکەی (٣ ملیۆن)کەس تووش دەبنو (٢ ملیۆن) کەس، ساڵانە بەهۆی ئایدزەوە دەمرنو تائێستا (٣٠ ملیۆن) کەس، بەهۆی ئایدزەوە مردوون.

*(٥٠٪) ی ئەوانەی تووشبوون بەهۆی هاوڕەگەزبازییەوەیە(نێربازیی)، (٢٧٪)یان ئەوانەن، کە ئالوودەی مادده هۆشبەرەکانن.

*(٣٦٪) تووشبووان ئافرەتانن (واتە: نزیکەی ١ ملیۆن ئافرەت، ساڵانە تووش دەبن).

*(٩٠٪)ی تووشبووان لە جیهانی سێهەمدا دەژین.

*نیوەی تووشبووان لە تەمەنی هەرزەکارییو لاوییدان (١٥ - ٢٤ ساڵ).

*مەزەندەکراوە هەموو ڕۆژێك (١٠,٠٠٠)کەسی نوێ تووش دەبن.

٢.نەخۆشی ئایدز(AIDS)و ڤایرۆسی (HIV) چییە؟

وشەی (HIV) کورتکراوەی (Human Immunodeficiency Virus)ە، واتە: (ڤایرۆسی کەمکەرەوەی بەرگری لە مرۆڤدا) ئەم ڤایرۆسە لە لەشدا، دەبێتە هۆی نەخۆشی ئایدز.

وشەی (AIDS) کورتکراوەی ((Acquired Immuno Deficiency Syndromeە، واتە: (کۆنیشانەی دەستکەوتوو بەهۆی کەمبوونەوەی بەرگریی لەش).

کاتێك ڤایرۆسەکە، دەچێتە ناو لەشەوە، هێرش دەکاتە سەر کۆئەندامی بەرگریی لەش (لەڕێی تێکشکاندنی جۆرێکی تایبەت لە خڕۆکە سپییەکان، کە دەبنە ڕێگر لە تووشبوونی مرۆڤ بە میکرۆبە جۆراوجۆرەکان)و بەرگری کەسەکە لاواز دەکات، ئیتر نەخۆشەکە بەرگەی لاوازترینو بچووکترین میکرۆب ناگرێت.

ڕەنگە بۆ ماوەیەکی زۆر(٦ مانگ - ١٠ ساڵ)، کەسەکە ئەم ڤایرۆسە لەناو لەشیدا بێتو بەڵام نیشانەکانی نەخۆشی ئایدزی لێ دەرنەکەوێت (کێشەکە لەوەدایە، خۆی نازانێت ڤایرۆسەکەی هەیەو توانای گواستنەوەی بۆ کەسانی تریش هەیە!)

پاش ئەوەی ڤایرۆسەکە تەواو لە لەشدا بەهێز دەبێتو بەرگریی کەسەکە وێران دەکات، ئینجا نیشانەکانی لێ دەردەکەوێت.

٣. چۆن ڤایرۆسی (HIV) دەگوازرێتەوە؟

* ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ کەسی تووشبوو (لەنێوان دوو کەسی هاوڕەگەز، یان ڕەگەز جیا).

* بەکارهێنانی دەرزیی پزیشکییو هەر ئامێرێکی تیژی دیکەی وەك گوێزان، بۆ زیاد لەکەسێك بەبێ پاکژکردنەوە.

*گواستنەوەی خوێن (بێ پشکنینو دڵنیابوون لەوەی بەخشەرەکە هەڵگری ڤایرۆسەکەیە، یان نا).

*بەرکەوتن بە برینو خوێنی کەسی هەڵگر.

*گواستنەوە لە دایکەوە بۆ کۆرپەلەکەی، یان لەڕێی شیرپێدانی سرووشتی.

* گواستنەوەو چاندنی ئەندامەکانی لەش.

بەڵام لەم ڕێگایانەوە ناگوازرێتەوە:

* کۆکەو پژمەی کەسی هەڵگر.

* باوەش پێداکردنو تەوقەکردنو بەرکەوتن (بە مەرجێك برین نەبێت).

* نانخواردن لەگەڵیو بەکارهێنانی ڤاپو ڤاچاغەکانی.

*بەکارهێنانی شانەو جلو بەرگو شۆردنیان.

*بەکارهێنانی سەرئاوو حەمامو مەلەکردن.

٤. چارەسەر چییە؟!

چارەسەری بنچینەییو بنەبڕکەر، تەنها بریتییە لە خۆپاراستن، واتە: ڕێگریکردن لە تووشبوون، ئەویش لەڕێی:

*ڕێنماییەکانی ئیسلام، بە دوورکەوتنەوە لە ئەنجامدانی سێکسی ناشەرعی.

*بەکارنەهێنانی دەرزیی بەکارهاتوو.

*پشکنینکردن بۆ هەر خوێنێك، پێش گواستنەوە.

*دوورکەوتنەوە لە مادده هۆشبەرەکان.

پێویستە ئاگاداربین: تاکوو ئێستا چارەسەری بنەبڕکەر نییە بۆ نەخۆشیی ئایدز، بەڵام ئەو نەخۆشانەی هیچ چارەسەرێك وەرناگرن، ئەوا زۆربەیان دەمرن!



# سوودەکانی کشمیش

کشمیش یەکێکە لە بەناوبانگترین میوەی وشککراوەو زۆرترین بەکارهێنانی هەیە لە جیهاندا، کە لە ئەنجامی وشککردنەوەی ترێوە دروست دەبێت، چەند جۆرێکی هەیە، بەپێی ڕەنگو تامو قەبارە، قەبارەکەی پابەندە بەجۆری ئەو ترێیەی وشك دەکرێتەوە، کشمیش زۆر بەسوودە لە ڕووی تەندرووستییەوە، بەهۆی ئەو ئاوێتە خۆراکییە بەسوودانەی تێیدایە، سوودەکانیش ئەمانەن:

### ١. باشکردنی کرداری هەرس

لە دیارترین سوودەکانی کشمیش، باشکردنی کرداری هەرسە، چونکە ڕۆژانە خواردنی، دەبێتە هۆی نەهێشتنی قەبزیو ڕزگاربوونی لەش لەو ژەهرەی لە ئەنجامی کرداری هەرسەوە پەیدا دەبێت.

### ٢. بەخشەری وزەیە بە لەش

کشمیش دەوڵەمەندە بەو کاربۆهیدراتە سرووشتییەی کە وزە بە لەش دەبەخشێت، بەبێئەوەی کێشی لەش زیاد ببێت، ئەمەش بۆ نوێبوونەوەی وزە، پاشو پێش وەرزشکردن بەسوودە.

### ٣. چارەسەری بەرزی گوشاری خوێن

کشمیش زۆر بەسوودە بۆ نزمکردنەوەی بەرزی گوشاری خوێنو پاراستنی دڵ، بەهۆی بوونی توخمی پۆتاسیۆم تێیدا.

### ٤. چارەسەری ترشەڵۆکی لەلەشدا

بوونی پۆتاسیۆمو مەنگەنیز لە کشمیشدا، وایان کردووە کە ترشەڵۆکی لەش نەهێڵنو ژەهری زیانبەخشی ناو لەش بکەنە دەرەوەی لەش، ئەمەش ڕۆڵی هەیە، لە یارمەتیدانیو پاراستنی لەش لە هەوکردنی جومگەکانو بەردی گورچیلەو نەخۆشییەکانی دڵ.

### ٥. پاراستن لە کەم خوێنی

یەکێکی تر لە ڕۆڵە گرنگەکانی کشمیش، چارەسەرکردنی کەمخوێنیو پاراستنی لە تووشبوون پێی؛ لەبەرئەوەی بڕێکی باش ئاسنو کۆمەڵەی ڤیتامین بیو مسی تێدایە ئەو توخمانەش، هۆکارێکن لە چارەسەرکردنی کەمخوێنیدا.

### ٦. پاراستن لە شێرپەنجە

دژە ئۆکسێنەری (کاچینج) کە ئاوێتەیەکی زۆر گرنگە لە کشمیشدا، ڕێگە لە پێکهاتنو دروستبوونی گرێ شێرپەنجەییەکان دەگرێت.

### ٧. تەندرووستی چاو

بوونی ئاوێتەکانی پۆلۆفینۆڵی دژە ئۆکسێنەر لە کشمیشدا، یارمەتیی بەهێزی ڕوانین دەداتو چاو لە نەخۆشییەکانی دەپارێزێت، هەروەها بڕێکی باش ڤیتامین A تێدایە، کە بەوە ناسراوە بۆ تەندرووستی چاو زۆر بەسوودە.

### ٨. پاراستنی ددان لە کلۆر بوون

لە کشمیشدا یەکێك لە ئاوێتەکانی فایتۆکیمیایی بەناوی (ئۆلیانۆلیك) هەیە، کە ددان لە کلۆربوون دەپارێزێت، هەروەها کشمیش ڕێگە لە گەشەی بەکتریای ناو دەم دەگرێت، ئەمەش ددانەکان بە تەندرووستی دەهێڵێتەوە.

### ٩. پاراستنی کێشی لەش

کشمیش دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە پاراستنی کێش لەشدا، لە ڕێگەی دابەزاندنی کێشی لەش بێت، یان زیادبوونی کێشی لەش، بڕێکی کەمی کشمیش، یارمەتی کێش دابەزاندن دەدات، بەهۆی بوونی ڕیشاڵو وزە تێیدا، هەروەها بڕێکی زۆری کشمیش، یارمەتیی زیادبوونی کێش دەدات، بەهۆی بوونی بڕێکی زۆری وزە، بێئەوەی زیان بەلەش بگەیەنێت.

### ١٠. بەهێزبوونی ئێسك

کشمیش سەرچاوەیەکی باشە بۆ کالیسیۆم، وەك ئاشکرایە کالیسیۆم بۆ تەندرووستیو بەهێزیی ئێسکەکان زۆر بەسوودە.

### ١١. بەهێزبوونی لایەنی سێکس

کشمیش بۆ تەندرووستیی سێکس بەسوودە، بەهۆی بوونی ترشی ئەمینی ناسراو بە (ئەرجنین)، هەروەها ئارەزووی سێکس بەهێز دەکات.

سەرچاوە: www.stylecraze.com

www.فوائد.com



# کلیلی چاکەکان

و: ئاسیا سەلاح

ئەم ناونیشانە نادیارە، ئامانجەکەشی ئەوەیە بیروهۆشتان ببزوێنێت، سەرچاوەکەشی لە فەرمودەیەکی پێغەمبەرەوە "ﷺ" وەرم گرتووە کە دەفەرموێت: «ڕاستگۆیی ڕێنمویت دەکات بەرەو چاکە، چاکەش ڕێنمویت دەکات بەرەو بەهەشت، کەسانی ئەوتۆ هەن، کە بەردەوام ڕاستگۆ دەبن، هەتا لای خودا بەڕاستگۆ دەنووسرێن.. درۆکردنیش بەرەو کاری خراپە ڕێنمویت دەکات، کاری خراپەش بەرەو دۆزەخ ڕێنمویت دەکات، کەسانی ئەوتۆش هەن، کە هەر درۆ دەکەن، هەتا لای خودا بە درۆزن ناودەبرێن». وشەی «بر» واتە: « چاکە» وشەیەکی گشتگیرە بۆ هەمووجۆرەکانی چاکە، وەك ئەوەی بڵێین کە کەسی ڕاستگۆ، هەموو جۆرە چاکەیەکی تێدایە، شەرەفی ئەندامێتی لە بەندە چاکەکانی ئەم نەتەوەیەی پێ دەبەخشرێت، هەروەها ڕاستگۆیی لە هەموو بارێکداو پابەندبوون پێیەوە، خاوەنەکەی لە نشێوییەکان دەپارێزێت، ئەوپەڕی سوودو قازانج دەگێڕێتەوە بۆ کۆمەڵگاکەی.

زۆر گرنگە ڕۆڵەکانم، ئەوە بزانن کە ئەمڕۆ درۆ هێندە لەناو خەڵکدا بڵاوە، کە دەتوانین بڵێین بووەتە یەکێك لە پەتاکانی سەردەم، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پارە زۆرەی کە لە هونەری پڕوپاگەندەو ئاگادارییەکاندا خەرج دەکرێت، کە لادانی لە ڕاستییەکان کردووە بە بنەما بۆ فریودانی خەڵك؛ تا کاڵاکان بکڕن، جگە لەوەش خەڵکی بە شێوەیەکی ناجۆر، چاویان کراوەتەوە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانیان، کە ئەوەش بەردەوام پاڵیان پێوە دەنێت، سوور بن لە سەر بەدەستهێنانی ئەوپەڕی سوودی چاوەڕوانکراو، ئیدی لە هەرچ ڕێگایەکەوە بێت.

ڕاستگۆیی ڕۆڵەکانم، واتە: ڕاستڕۆییو یەکسانی ناواخنو ڕواڵەت، بەردەوام ڕاستگۆیی پاڵنەرێك بووە بۆ دووركەتنەوە لە هەڵەکان؛ چونکە ڕاستگۆ دەزانێت کە هەڵەکردنو سەرپێچیو کارە نەشیاوەکان، ناچاری دەکەن، بکەوێتە داوی درۆکردنەوە، پاشان دەبێت پاساو بهێنێتەوە بۆ ئەو هەڵانەو پارێزگاری لە خۆی بکات، هەر بۆیە هەوڵ دەدات ڕاستگۆ بێت..

نەتەوە پێویستی بە ڕاستگۆییە؛ چونکە بنەمایەکە بۆ بڵاوبوونەوەی متمانە لە پەیوەندییە جۆراوجۆرەکانماندا، متمانەش خۆشەویستانم، سەرمایەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتیی ئێمە پێك دەهێنێت، خۆ ئەگەر لەدەستی بدەین، مەگەر بەچەند سەدەیەك بەدەستی بهێنینەوە، بۆیە لێرەوە کەسی درۆزن، کارێکی تێکدەری بەرفراوان دەکات، لە پێشدا زیانێکی گەورە بەخۆی دەگەیەنێتو دواتریش بە کەسانی دەوروبەری.

ڕاستگۆیی وامان لێ دەکات هەست بە ئاساییش، دڵنیاییو ڕوونیو ئارامی بکەین، پیاوچاکانی پێشووی ئەم نەتەوەیە، گرنگییەکی زۆریان بە ڕاستگوفتاریو شێوازی ئاخاوتن داوە؛ چونکە درۆو وتەی نابەجێو سەرلێشێواندنی خەڵك، زیانی زۆری تێدایە، لەو بارەیەشەوە دەگێڕنەوە: کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب "خوایان لێ ڕازی بێت"، حەوت جار بەدەوری کەعبەدا تەوافی کرد، دوو ڕکات نوێژی بەجێ هێنا، پیاوێکیش لە قوڕەیش پێی گوت: چەند خێرا نوێژو تەوافت کرد ئەی باوکی عەبدوڕەحمان؟! عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش دەفەرموێت: «ئێوە لە ئێمە زیاتر نوێژو تەواف دەکەن، ئێمەش لە ئێوە باشترین، ئێمە پابەندین بە ڕاستگۆیی گوفتارو دانەوەی سپاردەو بەجێهێنانی بەڵێن».

## ئەمە چی دەگەیەنێت بۆ ئێوە ڕۆڵەکانم؟

هەریەك لە ئێوە، ڕاستی بکات بە مۆرکێکی تایبەتیی خۆی، کە بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانیدا ڕەنگ بداتەوە، ئەم کارەش خودا لێی ڕازییەو پایەی بەندە بەرز دەکاتەوە لە لای.

با ئەقڵتان پێش زمانتان بکەوێت، هەموو وشەیەك لێك بدەنەوە، بەر لەوەی دەری ببڕن؛ چونکە زۆر گوزارشت هەیە، کە خاوەنەکەی لەناو دەبات، بەبێئەوەی بە خۆی بزانێت، لە پەیامبەرەوە "ﷺ" دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: " بەندە کە قسەیەك دەکات، لێی ناکۆڵێتەوە چۆنە، بەهۆیەوە بەناو ئاگری دۆزەخدا دەیبات، بەڕادەی دوورتر لە نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا"

قسە کەم بکەنەوە ئەگەر خێری تێدا نەبێتو مشتومڕو مقۆمقۆ مەکەن، هەروەها بەردەوام مەبن لەسەر مشتومڕی بێئەنجام.

نزمترین پلەکانی ڕاستگۆیی، ئەوەیە کە قسەی مرۆڤ لەگەڵ باوەڕەکەیو گومانە زاڵەکانیدا یەك بگرێتەوە، هەروەها لێکچوونی قسە لەگەڵ ڕاستەقینەشدا هەیە، کە دەبێت خاوەنەکەی دڵنیا بێت لەوەی کە دەیڵێت لەڕاستیدا هەیە، ئەوەشی نکوڵی لێ دەکات لە ڕاستیدا نییە.

ڕوو مەدەن بە درۆزنەکانو بەدەنگیانەوە مەچنو ئامۆژگارییان بکەن، لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە، کە هیچ ڕەوشتێك هێندەی درۆ لای هاوەڵەکانی پێغەمبەر "ﷺ" بێزراو نەبوو، کاتێك پیاوێك لە دیار پێغەمبەر "ﷺ" درۆی دەکرد، پێی ناخۆش دەبوو، دەروونی نائارام دەبوو بەو کارە، هەتا ئەو کاتەی ئەو پیاوە تۆبەی دەکرد، لەو درۆیەی کە کردوویەتی". موسلیم بە ئیسنادێکی صحیح گێڕاویەتییەوە.

لێرەدا مەبەستم نەبوونی، لاتیو نەداری نییە، بێئەوەی ئامۆژگارییەگ، یان ڕێنمایەك بکرێت، تۆ لێیان ڕابکەیت، مەبەستم هەژارییە لە بواری زانینو ڕۆشنبیریدا.

قەت بەکەم ڕازی مەبە، لە فێربوونی زانینو زانیاریدا، کەمتەرخەم مەبە، بەگوێرەی بارستایی بیرۆکەکانت، لەو بوارەدا سەرمایە کەڵەکە بکە، بەئەندازەی تێگەیشتنو هۆشیاریت، ناوەخنی کتێبەکان بپشکنە، پەڕەی کتێبە قەبارە گەورەکانو گۆڤارەکان هەڵبدەرەوە، پەنجەرەکانی ئینتەرنێت بۆ ئەو زانیارییانەی بەدەردت دەخوات، واڵا بکە.

برێ لە مەردم، هەرگیز ئەوەی دەیزانن، گەشەی پێ ناکەنو پێشی ناخەن، هەمیشە لە ناوچەیەکی بەرتەسکدا گیریان خواردووە، بیرۆکەکانیانو ئاسۆیی بیرکردنەوەیان بە کەڵکی گفتوگۆیەکی داهێنەرانە نایەت، ژێرخانی فکرییان کەڵکی ئەوەی پێوە نییە.

چۆن دەتوانێت لەگەڵ ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی ژیاندا دەربەرێت! یان وەڵامی دەوروبەر بداتەوە، لە کاتێکدا هەرچی زانینو ڕۆشنبیریەکەیەتی، زادەی چایخانەکان، یان گفتوگۆی هاوڕێیانەیە لە لاپەڕە کۆمەڵایەتێکاندا، ڕۆژێك پەرتووکێك بەدەستییەوە نەبینراوە، یاخود هەستی پێ نەکراوە خۆی گرد کردبێتەوەو بۆ مەسەلەیەکو لە گژفکراندا ڕۆچووبێت.

نموونەی ئەم کەسە، زۆربەی کات، ئەو قوتابیەم بیر دەهێنێتەوە، کە زۆرجار گفتوگۆم لەگەڵدا دەکرد، ئەوکاتێك دەچووە هۆڵەکانی تاقیکردنەوەوە زانیارییەکی باشی لەبارەی مار هەبوو، بەڵام لەبارەی بەرنامەکانی خوێندنەوە لە هەر زانستو زانیارییەکدا دەستەپاچە بوو! لە تاقیکردنەوەدا پرسیارێك دەهاتەوە، داوای دەکرد بە درێژی پێناسەی فیل بکات، هێندە بیری دەکردەوە تاشەکەت دەبوو، پاشان لە فێڵێك دەگەڕا، دەینووسی فیل گیانەوەرێکی زەبەلاحە، لوتێکی درێژی هەیە بەمار دەچێت، مار ... دواتر لە بارەی مارەوە، چی دەزانی بەدرێژی یاداشتی دەکرد.

ئەو قوتابیە هەژارە، هەمان تیۆری ئەو هەژارانەی بەسەردا دەچەسپێت، کاتێك یەکێکیان بیرۆکەیەك، یان زانیارییەکی لەبارەی شتێك هەبێت، پێی وایە ئەوە هەموو شتێکە، هەستو هۆشی لە ڕووبەرێکی تەسکدا قەتیس دەکات.

بەداخەوە، زۆرماندوو دەبم، کاتێك لەگەڵ کەسێکدا گفتوگۆ دەکەمو دەیبینم لە گۆشەیەکدا هەڵکورماوەو ناجووڵێت، ئاسۆی بیرکردنەوەی هێندە بەرین نییە، شتێکی تازە وەرگرێت، بە هیچ شێوەیەك ڕەخنەی قەبووڵ نییە، هەرکاتێك قسەیەك وەك ڕەخنە بە ڕوویدا بدرێت، ئەو کارە بە دەستدرێژی ناو دەباتو بەرانبەرەکەی بە کاڵ فامو نەزان دەچوێنێت.

دەنگ بەرز دەکاتەوە، بە شڵەژاوییەوە، دوپاتی دەکاتەوە کە ڕاستی لای ئەوە، دەمارگیرێکی سەختە، لە کاتی گفتوگۆو وتووێژدا بەرۆکت دەگریو لە جوغزێکت دەپەستێ، کە شارەزای کونو کەلەبەرەکانێتی.

بەڵام هاوڕێ، پێویستە تۆ خۆت لەو داوە نەدەیت، ڕزگاربوونت لەو تەپکەیە، تەنها بە زانینو ڕۆشنفکریو بیرکردنەوە دەبێت.

لە کاتێکدا سەرقاڵی خوێندنەوەیت، لە لاپەڕەکانی مێشکتدا بە هەوڵو کۆشش نەقشێك هەڵدەکۆڵیت، لە تاقیکردنەوەو بیرۆکەو تێزەکانتدا "واتە: زانینو زانیارییەك دەخەیتە سەر ئەو لاپەڕەیە" بەو زانستو زانیارییانە، بەسەر کەسە ئاساییەکاندا سەر دەکەویت.

کاتێك لەبەردەست زانایانو گەورەپیاواندا دادەنیشت؛ ئەوا چەند ڕۆژێك دەخەیتە سەر لاپەڕەکانی تەمەنت، ئاستی تواناو تێگەیشتنەکانت هەڵدەکشێن.

کاتێك لە حاڵی هەندێك تێ دەفکریت، وردبینی لە فەلسەفەی قەزاوقەدەردا دەکەیت، بیر لەدانایيو ژیری خودای باڵادەست دەکەیتەوە، لەبارەی ڕۆزی، یاساغکردن، پێدانی پلەوپایە، بەرزکردنەوەو نەویکردنی کەسێك، هەست بە ڕاستییەکی سەرنجڕاکێش دەکەیت، ئاستێکی جوانت دەبێت، لە تێگەیشتنو تێڕوانین بۆ ژیان.

دەگوترێت: ڕۆشنبیر کەسێکە هەموو شتێك، لە شتێکدا دەزانێت، شتێکیش، لە هەموو شتێك، ئەمە یەکێکە لەوپێناسانەی، بۆ کەسێکی هۆشمەندی بیرکراوە دەکرێت.

هاوڕێ، پێویستە بەم شێوەبیت، بەخەمخۆرییەوە پێت دەڵێم: لەبارەی هەموو شتێك ... هەموو شتێك وەخوێنە.

(٥٠٪) ڕۆشنفکرییەکەت تەرخان بکە بۆ ئەو ڕشتەیەی دەتەوێت پسپۆڕ بیت تێیدا، (٥٠٪) بۆ لایەنەکانی تر، کاتێك ڕۆژنامەیەك واڵا دەکەیتەوە، پەڕەکانی هەڵدەدەیتەوە، چاوت لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆشنبیری، هونەری، وەرزشیو ڕامیاری دەگیرسێتەوە، هەموو ئەو زانیارییانە "زانیارییەکان هەرچییەك بنو چەند بێبایەخبن" دڵنیابە بە شێوەیەك لە شێوەکان، ڕۆژێ لە ڕۆژان بە کەڵکت دێن.

لە کۆتاییدا دەمەوێت، شتێکت پێ بڵێم: لەو کەسانە مەبە، کە بێ پلان هەموو شتێك دەخوێنێتەوە... دەستم دامێنت لە بەرانبەردا لەو کەسانە نەبیت، کە تەنها یەکجۆر زانستو زانیاری دەخوێننەوە، لە تەنها بوارێکدا خۆیان ڕۆشنبیر دەکەن. بەشێوەیەکی فراوان لە بواری ڕۆشنبیریدا کار بکە.

هەردوو گرووپ، خاوەنی دیدگایەکی تەسکو ڕۆشنبیرییەکی پەرتوبڵاون... ناتوانێت نە بۆ خۆی، نە بۆمیللەتەکەی، مێژوویەك، نەمرییەك، تۆمار بکات.

پوختە: لە گشت شتێکدا پسپۆڕ بە، لە هەموو بوارێکدا خوێنەر بە.



# چەند لە تواناتدایە، لە هەژاری هەڵێ

و: چیمەن لەتیف

# ئایا تۆ کەسێکی لێبوردەی؟

بۆئەوەی بزانیت، تا چەند سیفاتەکانی کەسێکی لێبوردە لە ناختدا بوونی هەیە، بەوردیو درووستی، وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە، دواتر بۆ هەر وەڵامێك، خاڵی تایبەت بە خۆی هەیەو لە کۆتاییدا خاڵەکانت کۆبکەرەوە؛ تا بزانیت کەسێکی لێبوردەیت، یان پێچەوانەکەی..

١- ئایا لەو باوەڕەدایت ڕەگەزی تۆ باشترە، لە سەرجەم ڕەگەزەکانی دیکە؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٢- ئایا دژایەتی بوونی منداڵی هاروهاجو فێزەفێزکەر دەکەیت؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٣- ئایا دژایەتی منداڵەکەت دەکەیت، ئەگەر زانیت هاوڕێیەکی نامۆی هەیە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٤- ئایا لەو باوەڕەدایت، کە ئەو مامۆستایانەی لێبوردەن، بەرپرسیارن لە هەڵسوکەوتی فێرخوازە خراپو هاروهاجەکان؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٥- ئایا لەو کەسانە بێزاری، کە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسانێك دەکەن، کە هاوئایینی خۆیان نین؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٦- ئایا لەو باوەڕەدایت، کە ئاستی ڕەوشتبەرزیو ئاکارجوانی کەسانی دیندار، لە بەرزبوونەوەو زیادبووندایە؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٧- ئایا دژایەتیی ئەو ڕێکخراوە ئاینییانە دەکەیت، کە لە دەرگای ماڵتان دەدەنو دەیانەوێت ئایینەکەیانت بۆ شی بکەنەوە؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٨- ئایا لەو باوەڕەدایت کە پێویستە تاوانباران سزایان زیاترو سەختتر بکرێت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٩- ئایا لە نێو باخچەکەتدا، ڕێگری لە بوونی پشیلە دەکەیت؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٠- ئایا ڕێگری لە بەکارهێنانی مۆبایل دەکەیت لە شەمەندەفەردا، یان شوێنە گشتییەکاندا؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١١- ئایا دژایەتیی ئەو مەڵبەندانە دەکەیت کە تایبەتن بە ڕووداوە نوێیەکانی ڕۆژ، کە لە گەڕەکەکەتدا دەکرێتەوە؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٢- ئایا دراوسێی بێزارکەرت هەیە، کە زۆربەی کات ئاژاوەیانەو دەنگیان بەرز دەکەنەوەو لە تۆ تێ ناگەن؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٣- ئایا ژمارەیەك لە هاوڕێی جیاوازت هەیە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٤- ئایا بڕوات بەوە هەیە، کە ئافرەتانیش مافی ئەوەیان هەیە لە مزگەوتەکان نوێژی بەکۆمەڵو نوێژی هەینی ئەنجام بدەن؟
أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٥- ئایا بانگهێشتی ئەو ئاهەنگانە ڕەت دەکەیتەوە، کە پڕن لە ژاوەژاوو دەنگەدەنگ؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

تێبینی:

١- بۆ ژمارە (١-١٢)، بۆ وەڵامی بەڵی (سفر)و بۆ وەڵامی نازانم (١)و بۆ وەڵامی نەخێر (٢) خاڵ دابنێ.

٢- بۆ ژمارەکانی (١٣-١٤-١٥)، بۆ وەڵامی بەڵی (٢) خاڵو بۆ وەڵامی نازانم (١)و بۆ وەڵامی نەخێر (سفر) دابنێ.

ئەنجام:

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان(٢٦-٣٠) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی لە ڕادەبەدەر لێبوردەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (٢٢-٢٥) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی لێبوردەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (١٨-٢١) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی جۆرێك لە لێبوردەیت تێدایە.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (١٣-١٧) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی هاوسەنگی.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (٩-١٢) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی تاڕادەیەك لێبوردەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان(٥-٨) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی لێبوردە نیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان(٠-٤) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی بەهیچ شێوەیەك خاوەنی سیفەتی لێبوردن نیت.



* قسەکان وەکوو پۆشاك وەهان، پێویستە پێش ئەوەی پێیەوە بچینە دەر بۆ لای خەڵکی، لەسەر خۆمان تاقی بکەینەوە.

* ئەگەر نامەیەکت بۆ هات، تووڕەی کردیت؛ وەڵامدانەوەی بۆ ڕۆژی دواتر دوا بخەو ڕاستەوخۆ وەڵامی مەدەرەوە؛ ئیدی پاش ڕۆژێك خۆت وەها دەبینیتەوە؛ یا بەدانایی وەڵامی دەدەیتەوە، یا وەهای دەبینت شتێکی بێبەهایەو شایستەی وەڵامدانەوە نییە.

* باشترینو خۆشترین بۆن، کە بۆنو بەرامەکەی نابڕێتەوە، تەنانەت پاش ئەوەی خاوەنەکەی چووە ژێر گڵ: بۆنی ڕەوشتجوانییە.

* پێش ئەوەی شتێك ببەخشیت، بزانە بەهاکەی لای کەسی بەرامبەر چەندە؛ ئەمەش بۆئەوەیە؛ تا شتێك بە کەسێك نەبەخشیت، کە نرخو بەهای بەخشینەکە نازانێت.

* هەموو ڕەنگەکان، لە ڕەنگی سپییەوە دێن، ڕەنگی دڵە سپییەکەت بپارێزە، با تاریکی چواردەوریشت نووتەك بێت!

* بۆ دەردی تووڕەیی، دەرمانی بێدەنگی هەیە.

*گەر نەتتوانی دەمی شڕی کەسانی دی دابخەیت؛ گوێیەکانت دابخە.

* ئەو کاتەی ئەو نیوەیە نابینیتەوە، کە شایستەی تۆیە، نەکەی بە هەر نیوەیەکی دی ڕازی بیت؛ چونکە بەدبەختیت لەو کاتەوە دەست پێ دەکات، کە بەشتێك ڕازی دەبیت، لەگەڵتدا ناگونجێتو حەزت پێی نییە.

* کەسێك کە لەسەر پێی خۆی بووەسێت، پێویستی بە گۆچانی کەسانی دیکە نییە.

* کاتێك قسەی ڕاست دەکەیت، تەنها ئەو مرۆڤانە لەدەستت بێزار دەبن، کە هەموو ژیانیان، لەسەر درۆ بەندە.

## کورتەنامە





# پۆستەچیی گوتەی چاك

ئەسكەندەر ڕەحیم

دەگێڕنـــەوە: ئافرەتێك كە تازەكـــی هاتبووە گەڕەكێكو لەوێ نیشـــتەجێ بووبـــوو، دەچێتە لای ژنە هاوســـێیەكیو دەردی دڵی خـــۆی بۆ هەڵدەڕێژێتو گلەوگازندە لەو دەرمانخانەیە دەكات، كە لە گەڕەكەكەیاندایەو دەڵێت:

ئەو دەرمانخانەیە، بەگفتولفتو خۆش مامەڵە نین، كەسێك ناچار نەبێت، جارێكی دیكە، ناچێتەوە بۆ ئەوێ. دراوسێی ئازیز، بۆیە ئەم گلەوگازندەش لای تۆ دەكەم؛ چونكە تۆ، بەپێی ئەوەی دەمێكە لەم گەڕەكە نیشـــتەجێیتو خاوەنـــی ئەو دەرمانخانەیە، لە من باشـــتر دەناسیت، هیوادارم ئەم بێزاریو گلەییەی منی پێ بگەیەنیت؛ تا لەگەڵ كڕیارەكاندا خۆشمامەڵەو خۆشخوو بێت.

ژنـــە هاومالەكەشـــی پێـــی گوت: مـــن ئەم قسـانەی تۆ، بەو دەرمانخانەیـــە دەگەیەنـــم، بـــەڵام پاش ئەوەی ئـــەم كارەم كرد، جارێكـــی دیكە، ســـەردانیان بكـــەرەوە، بزانە ئـــاكارو مامەڵەیان گۆڕاوە، یان نا؟

پاش ئەوەی ژنە هاوماڵەكەی چوو بۆ لای دەرمانخانەكە، بۆ جاری دووەم ژنە تازەنیشتەجێبووەكەی ئەو گەڕەكە، سەردانی دەرمانخانەكەی كردەوە، پاش ئەوەی كە هاتەوە، هاوسێكەی لێی پرسی:

چی بوو؟ هیچ ڕەفتاری گۆڕابوو؟

ئەویـــش گوتی: ئەم جارە، زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی كردم، ڕێزو نەوازشـــێكی بێئەنـــدازەی گرتم.. دڵنیام ئـــەو گلەوگازندەو بێزارییەی لای تۆ هەڵم ڕشت، پاشان تۆ پێت گەیاند، كاری خۆی كردووەو گوفتارو ڕەفتاری گۆڕیوە.

ژنـــە هاوماڵەكەش گوتی: بەو چەشـــنە نییـــە، كە بیری لێ دەكەیتەوە.

ئەویـــش گوتی: ئەی چۆنـــە؟ ئەی بۆچی وا خێـــرا ڕەفتاری گۆڕا؟

ژنە هاوســـێكەی گوتی: كاتێك چووم بـــۆ لای دەرمانخانەكە، گوتـــم: ماڵێكی تازە هاتووە بۆ گەڕەكەكەمان، دراوســـێی ئێمەیە، پێی گوتووم، كە لە ئاست گوفتارو ڕەفتاری شیاووشیرینی خاوەنی ئەو دەرمانخانەیە زۆر سەرسام ماوم، دەتوانم بڵێم، تا ئەم ساتەی تەمەنم، دەرمانخانەی وەها باشم نەدیوە، باشترین دەرمانخانەیە، كە تا ئێستە مامەڵەم لەگەڵدا كردبێت!

دیارە لەم بەسەرهاتە پڕپەندو ئامۆژگارییە، ئەوە فێر دەبین، گەیاندنی قســـە، بەو جۆرەی كە دڵ دەیخوازێتو ئەرێنیو باشە، خۆشمامەڵەییو ڕەفتارجوانی دەهێنێتە كایەو هەلی بەدەستهێنانی سەركەوتن لە ژیاندا دەستەبەر دەكات.



# گەورەی گەردوون

**زاهیر زانا**

مرۆڤ بەرزترینو بەهۆشترینو زیرەکترین درووستکراوی خودایەو ڕێزی سەرداریی لێ نراوەو بەرگی گەورەیی بەبەردا بڕاوەو پلەی جێنشینی پێ خەڵات کراوە، هەر ئەم گەورەییو سەردارییەی، دەیخاتە ژێر باری بەرپرسیارێتیی گەورەو مەزنو ڕۆڵی سەرەکی لە شانۆی ژیاندا پێ دەگێڕێتو بۆ بینینی ئەو ڕۆڵە مەزنو گەورەیەش، دەبێت هۆشیارو بەئاگا بێتو خۆی بناسێت؛ تا بتوانێت پەی بە نهێنییە شاراوەکانی ناخو دەوروبەری خۆی بەرێتو بزانێت کە گەردوونێك لەناخیدا شاراوەتەوەو کراویشە بەگەورەی ئەم گەردوونە، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾ الجاثیة: ١٣ (خوای گەورە هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە بۆ مرۆڤی بارهێناوەو دەستەمۆی کردووە).

بۆیە دەبێت لە گەورەیی خۆمان تێ بگەینو کارێك بکەین شایەن بێت بەو گەورەییو مەزنییەی کە درووستکەری ئاسمانو زەوی پێی سپاردووین، خاوەنی ئامانج بینو پەیامدار بین، گرفتو بەربەستەکان تێك بشکێنینو بەرەو لوتکەکان هەنگاو هەڵبگرین، خاوەنی دڵێکی پڕ لەشادیو دەروونێکی درووست بین، کارەکانمان لەگەڵ سرووشتی بنچینەیی خۆماندا یەك بگرێتەوەو ببێتە هۆکاری ئەوەی کەبەختەوەرمان بکاو بگەینە ئارامی دەروونی، ساتو کاتەکانی ژیانمان بەبەرهەمداری ببەینە سەرو تەمەنمان بەفیرۆ نەدەین؛ لەبەرئەوەی ئێمە، گەورەی گەردوونینو هەموو گەورەییەك ڕەنجو ماندوبوونی خۆی دەوێت، ئێمەش دەبێت شان بخەینە بەر ئەو لێپرسراویەێتییەو بزانین گەردوونێك بە ئێمە سپێردراوە، وەك سەعدی شیرازی دەڵێت: (ابرو بادو مەو خورشیدو فلك عقن در کارند، تا تو نانی کە بە کف آریو بە غفلت نخوری، همە از بهر تو سرگشتەو فرمانبردار، شرط انصاف نباشد کە تو فرمان نبری) واتە: هەورو باو مانگو خۆر لە کاردان، تا تۆ نانێ بەدەست بهێنیو بەبێ هۆشی نەیخۆی، هەموو بۆ بەهرەی تۆ ملکەچو فەرمانبەرن، بێویژدانییە بۆ تۆ کە گوێڕایەڵو فەرمانبەر نەبێت؟!

کەواتە: پێویستە ساتێك بوەستینو بەشێوازێکی تر بۆ شتەکان بڕوانینو ئەم گەردوونە بەم فراوانییەوە، ئێمە تێیدا کەشتییەوانین، ئێمەین سەرداری بوونەوەر، نابێت بهێڵین ساتەکانمان بە هەدەر بڕواتو تێبپەڕێت گەر کارێکی باشی تێدا نەکەین، خۆر کە بۆ ئێمە دەسووڕێتەوە، تا ئێستا چرکەیەك لەفەرمانەکان لای نەداوەو هەمیشە ڕۆڵی خۆی گێڕاوەو تیشکە درەوشاوەکانی پەخش کردووەو بەیانیان پێی گوتووین هەستنو دەست بکەن بەکۆششو ئێوارانیش ئێوارە شادی پێ گوتووینو مەحوی ئاسا ڕای گەیاندووە:

**شەو کەسێ پرسی لە خۆ دەرخستنی پەروانە شەو**
**ئەو وتی: نا تێگەیشتوو تەجرەبەی مەردانە شەو**
**هەر سیا بەختانی عیشقە مەزهەری نووری هودان**
**شەو نەبێ ئەستێرە مەستوورە بەکەم مەڕوانە شەو!**

ئازیزانم ئێمەی مرۆڤ، کە گەورەی گەردوونین، نابێت بەکەم بۆ هیچ شتێك بڕوانین، بەڵکوو دەبێت ئەوە بزانین، زۆرێك لەو شتانەی بۆ ئێمە ڕام کراوە، لە ئێمە بەهێزترن، گەر بەهێز بنازین.. لە ئێمە گەورەترن بە قەبارەو شکڵ، گەر شانازی بەوەوە بکەین.. زۆر بوونەوەریش هەیە لە ئێمە جوانترەو هەتا دوای تەنانەت گەورەبوونی ئێمە لە ڕووی جەستەییەوە زۆر دیاریکراوو مەودادارترە لەبوونەوەرەکانی تر، بەڵکوو ئەو شتەی ئێمەی جیا کردۆتەوە ڕۆحی ئێمەیە؛ چونکە خوای گەورە لە ڕۆحی بەرزو پیرۆز، کە خوڵقێنراوی خۆیەتی، کردۆتە بەری باوەگەورەمانو ئەو گیانەیە تایبەتمەندی پێ بەخشیوینو ژیریشی پێ بەخشیوین؛ تا کار لەسەر پاراستنو گەشەکردنی گیانمان بکەینو هەموو ڕۆژێك گیانمان گەورەتربێتو زانستو زانیاریی زیاتر کۆ بکەینەوەو پەرۆش و خەمخۆر بین بۆ هاوکاری کەسانی ترو زەوی بەجۆرێك ئاوەدان بکەینەوە، کە شایەنبێت بە ئێمەی جێنشین.

# وەڵامی بەجێ

جووتیارێک ستەمی لێکرابوو، ڕۆیشت بۆ لای پادشاو باسی ستەملێکراویی‌و مەزڵوومی خۆی بۆ کرد، پاشا گوێی بۆ قسەی جووتیارەکە نەگرت‌و گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نەدا..خۆی بە کارێکی دیکەوە سەرقاڵ کرد.

جارێکی دیکە، جووتیارەکە خۆی بردە پێشەوەو دووبارە باسی ستەملێکراویی خۆی کرد، پاشا ئەمجارەشیان ڕوی وەرگێڕا.

بۆ جاری سێیەم، جووتیارەکە باسی ستەملێکراویی خۆی کرد بۆ پادشا، ئەمجارەیان پادشا تووڕەبوو، گوتی: کابرای چەنەباز، دەردەسەرمان لە کۆڵ بکەرەوە!جووتیارەکە گوتی: کە تۆ سەریت، ئەرێ پێم ناڵێیت، دەرد بۆ کوێ ببەم؟!

کچە خوێندکارێک، کە لە منداڵیدا چاوێکی لە دەستدا بوو، ڕۆژێکیان بە خەمبارییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵ‌و لە دایکی پرسی: دایەگیان، کاتێک لەدایک بووم، چاوێکم نەبوو؟ دایکی گوتی: نەخێر، کچی شیرینم، تۆ کاتێک منداڵ بوویت، ڕۆژێک چەقۆیەکت بە دەستەوە بوو، یاریت پێ دەکرد، منیش ویستم لێت بسەنم، تۆ دەستت کرد بە گریان، منیش ئەوەندە خۆشم دەویستیت، دڵم نەهات لێت بسەنم‌و تۆ بگرییەنم، لەبەرئەوە چەقۆکەم لێ نەسەندی، پاش ماوەیەک هاوارت لێ بەرزبوویەوە، کە بەدەم هاوارەکەتەوە هاتم، بینیم چەقۆکەت لە چاوی خۆت دابوو، بەداخەوە ئەو ڕۆژە تۆ چاوێکت لەدەست دا!

کچەکە لەوەڵامدا گوتی: خۆزگە ئەو ڕۆژە بتگریانمایە، کە تەنها ڕۆژێک بوو، نەک هەموو ڕۆژەکانی تەمەنم بمگرێنیت! من ئێستا هەر ڕۆژێک سەیری خۆم دەکەم، بۆ چاوی خۆم دەگریم، بەڵام ئەو کات تەنها یەک ڕۆژ دەگریام‌و دواتر ژێر دەبوومەوە!

* پیاوێک گوێی لێ بوو کەسێک، هاواری دەکردو دەیگوت: کوان ئەو کەسانەی وازیان لە دونیا هێناوەو پەرۆش‌و موشتاقی قیامەتن؟ کەس وەڵامی نەبوو، پیاوەکەش بە هێمنی پێی گوت: کاکە ئەگەر قسەکەت پێچەوانە بکەیتەوە، دەست بخەرە، سەر هەر کەسێک کە دەتەوێت!



هەمیشە دڵنیا بە لەوەی کە لەسەر ڕێگای ڕاستیت، پاشان بەردەوام بە بەرەو پێشەوە.

داڤی کرۆکێت - سیاسەتمەدارو سەربازی

ناتوانین کێشــەکانمان چارەسەر بکەین، لەڕێگای هەمان جۆری ئەو بیرکردنەوەیەی کە لە کاتی درووستبوونی کێشەکە بەکارمان هێنا .

ئەنیشتاین

پرسیار: سەرکەوتن چییە؟

وەڵام: زۆر پێبکەنم و دڵخۆش بم، کاتێکیش شەوانە دەچمە نێو پێخەفەکەمەوە، لە خودی خۆم و ژیانی خۆم ڕازی بم.

باوەڕ ناکەم پێوەرە جیهانییەکان بۆ سەرکەوتن، ئاوا ناوازە بن!

مادلین لانگل - نووسەر

ڕووداوە ناخۆشەکان، وەکوو چەقۆ وان، یا یارمەتیمان دەدەن، یا بریندارمان دەکەن، ئەویش بەپێی ئەو شوێنەی دەستی پێوە دەگرین؛ چەقۆکە بە دەسکەکە دەگرین، یا بە نووکە تیژەکەی!!

جەیمس ڕەسل لۆوێل - شاعیروسیاسەتمەدار





# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

## ٩ ئەندرۆ وایڵز

## Andrew Wiles

نارین جووتیار

زانای بیرکاری ئەندرۆ وایڵز، بە ڕەگەز بەریتانییە، لە بلیمەتەکانی جیهان هەژمار دەکرێت، بەپێی پێوەری جیهانی، ئاستی زیرەکییەکەی دەگاتە ١٧٠، لە ڕێگەی تیۆری ڤێرماوە ناوبانگی دەرکردووە.

ئەندرۆ لە ٢١ی نیسانی ١٩٥٣ لەکامبریدج، ئینگلترا لەدایکبووە، بە یەکێك لە باشترین زاناکانی بیرکاریی سەردەم دادەنرێت، بەتایبەتی لە بواری ئەندازەی جەبری تیۆری ڕێژەیی شێوە ئەندازەییەکان. هەر لە منداڵییەوە، گرنگیی زۆری بە بواری بیرکاری داوە، هەمیشە دواین کەس بووە، کە لە قوتابخانە ماوەتەوە بۆ شیکردنەوەی پرسیارە بیرکارییەکانو بەردەوام هەوڵی فێربوونو پێگەیاندنی خۆی داوە لەو بوارەدا، هەموو کات کتێبی لەکتێبخانەیەکی نزیکییەوە وەردەگرت، یەکێك لەو کتێبانەی وەری گرتووە لە کتێبخانە لەسەر بابەتی تیۆری ڤێرما بووە، کە ساڵانیکی زۆر بێ شیکارکردن مابوویەوە، پێی وابووە شیکارکردنی ئاسان دەبێت ئەگەر هەوڵی بۆ بدات هەربۆیە هەوڵی زیاتر فێربوونی دا، لە کاتێکدا تەمەنی تەنها ١٠ ساڵ بوو.

**گەشتی ئەکادیمی:** لەساڵی ١٩٧١ کۆلێژی میرتۆنی تەواو کردووە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، لە ١٩٧٤ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بیرکاری بەدەست هێناوەو لەهەمان کۆلێژ وانەی وتۆتەوە، پاشان لە کۆلێژی کلێر ساڵی ١٩٧٨ بڕوانامەی دکتۆرا لە بیرکاری وەردەگرێت لە زانکۆی کامبریج، دواتر لە ١٩٨٠ بووەتە پرۆفیسۆر لە زانکۆی برینستون، لەهەمان کاتدا پرۆفیسۆری یاریدەدەر بووە لە زانکۆی هارڤاردی ئەمریکی، بەم شێوەیە هەموو پلەکانی زانکۆ دەبڕێت، تا دەبێت بە ئەندامی کۆمەڵەی ئەکادیمیای بیرکاری.

**تیۆری ڤێرما:** گەورەترین دەستکەوتەکانی وایڵز سەلماندنی بیردۆزی ڤێرمای کۆتایە، توانی بەرەنگاری ئەو کێشەیە ببێتەوە، کە ماوەی زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ گەورە زانایانی بیرکاری لە بەرامبەر شیکردنەوەیدا دەستەوەستان بوون، ئەوەبوو لە ١٩٩٣ سەرەڕای سەختی، دوای هەوڵێکی زۆر، توانی شیکاری ئەو کێشە بیرکارییە ڕابگەیەنێت، سەلماندنی ئەو بیردۆزە، شۆڕشێکی نوێ بوو لەو بوارەو دەرگای تری کردەوە لە بەردەم چەندین کێشەی لاوەکی تردا. کە بەکار هێنرا بۆ بەرەوپێشخستنی کۆدی تۆڕی پەیوەندیکردن لە کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت کە پارێزگاری دەکات لە ژمارەی نهێنیو زانیارییەکان. دکتۆر ئاماژە بەوە دەکاتو دەڵێت: شیکارکردنی تیۆری ڤێرما، هەمیشە لە هزرمدا هەبووە، بەڵام نەك بۆئەوەی ببم بە زانای بیرکاری، بەڵکوو تەنها حەزێکی هەرزەکاریم بوو، کە بەپەرۆشەوە هەوڵم بۆی دەدا.

**نهێنی سەرکەوتنی:** ئەندرۆ هەوڵی زۆری داوە؛ تا شارەزاییەکی زیاتر لە بواری بیرکاریدا بەدەست بهێنێت، هەمیشە کەسێتییەکی هێمنو لەسەرخۆی هەبووە، دوای ئەوەی ئازایەتی ڕای دەکێشێت بەرەو وەبەرهێنان، کە تەمەنی تەنها حەوت ساڵ بووە.. لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا، توانیویەتی تیۆری ڤێرمای کۆتا بدۆزێتەوە، هەربۆیە تواناکانی جێی سەرسوڕمان بووە، بەڕادەیەك هەستی بەوە نەکردووە، کە هەندێ کێشەو پرسیار هەن، شیکردنەوەیان بۆ نەکراوە لە بیرکاریدا، هەمیشە بڕوای وا بووە، کە بۆ هەموو کێشەیەك، چارەسەرێكو بۆ هەموو پرسیارێك، شیکردنەوەیەك هەیە، ئەوە ڕێگاخۆشکەر بوو؛ تا بگات بە پلەی پرۆفیسۆریو لە چارەسەرکردنی کێشە بیرکارییەکان ناوبانگێکی زۆر پەیدا بکات. وایڵز دەڵێت: بیرکاری خۆی لەخۆیدا بابەتێکی سەختە، ڕێگای کورتکراوە نییە بۆ فێربوونی، یان شیکردنەوەی، تەنها هەندێ خەڵك، بەهرەمەندترن لە هەندێکی تر، بەڵام هێشتا دەبێ ململانێ بکەیت؛ چونکە فێربوونی چەند قۆناغێکی دەوێت، بنەمای بیرکاری وایە، هەر شتێکت بوێت، پێویستە ڕاهێنانی لەسەر بکەیت.

**خەڵاتو سەرکەوتنەکانی:** وەکوو ڕێزگرتنێك بۆ هەوڵەکانی پرۆفیسۆر وایڵز، چەندین خەڵاتی گرنگی پێ بەخشراوە، خەڵاتی سکوك لە ئەکادیمیای سویدی زانستی، خەڵاتی کول لە کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ بیرکاری، خەڵاتی ئەکادیمیای نیشتمانیی ئەمریکی بۆ زانست، خەڵاتی ئوستریسکی، خەڵاتی ولفو خەڵاتی نۆبڵ کە بریتییە لە مەدالیای فیلدز، لە ١٩٩٥ خەڵاتی ڤێرما، لە ١٩٩٦ مەدالیای شاهانە، هەروەها لە ١٩٩٨ خەڵاتی شا فەیسەڵ وەردەگرێت بۆ بیرکاری، لە ٢٠٠٥ خەڵاتی شۆ، پاشای بەریتانیا نازناوی «شاسوار»ی پێبەخشیوە.

لە ئێستادا وایڵز لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەژیو ئەندامی ئەکادیمیای نیشتمانیی ئەمریکییە بۆ زانست، زۆربەی کاتەکانی بە گەشتکردن بەسەر دەبات، خێزاندارەو خاوەنی سێ کچە بە ناوەکانی (کلیر، ئۆلیڤیا، کیت).






# هەڵویستی هەیاس لەسەر شایەتیدان:

هەیاسی خاس دادوەرێکی بە ئەزموونو کەم وێنەبووە، بۆ وەرگرتنی شایەتی لە هەر کەسێك، هەیاس زۆر بەوردی پاڵفتەی دەکردو تاقی دەکردەوە، تا دڵنیا نەبوایە لەسەر ڕاستیی شایەتییەکەی، شایەتییەکەی لێ قەبوڵ نەدەکرد، خۆ ئەگەر شایەت لە پاڵفتەو بێژنگو تاقیکردنەوەکانی هەیاس دەرنەچووایە، هەر کەسێك بووایە، شایەتییەکەی لێ قەبووڵ نەدەکرد.

هەیاسی خاس لەو لەو بارەیەوە دەڵێت: من فێڵباز نیم، بەڵام هیچ فێڵبازێك، ناتوانێت فێڵم لێ بکات..

جارێکیان پیاوێکی موسوڵمان، لە دادگاکەی هەیاس، شایەتییەکەی ڕەت کرایەوەو هەیاسی خاس شایەتییەکەی وەرنەگرت، شایەتەکەش زۆری پێ ناخۆشبوو، لەبەرئەوە ڕۆیشت بۆ لای حەسەنی بەسریو سکاڵای لە هەیاسی خاس کردو گوتی: قازی هەیاس شایەتییەکەی وەرنەگرتووەو ڕەتی کردۆتەوە.. لەکاتێکدا من لە ڕاستگۆیانم.

حەسەنی بەسری زاناو پێشەوای ئەو سەردەمە، کە شایەتەکەی دەناسیو دەیزانی کەسێکی موسوڵمانە، بە بیستنی ئەم هەواڵە نیگەران بوو، لەبەرئەوە بەرەو دادگاکەی هەیاسی خاس کەوتە ڕێ، کاتێك گەیشتە دادگا، هەیاسی خاس بەگەرمی پێشوازی لێ کردو گوتی: دەبێت چی زانای پایەبەرز، حەسەنی بەسری هێنابێتە ناو دادگاکەی هەیاس؟!

زانای بەناوبانگ، ڕووی لە هەیاسی خاس کرد؛ تا مەبەستی هاتنەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە، پێی گوت: جەنابی قازی، بۆچی شایەتیی فلان موسوڵمانت ڕەت کردووەتەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەر "ﷺ" دەفەرموێت: (مَنْ صَلَّى صَلاتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَهُوَ الْمُسْلِمُ ، لَهُ مَا لَنَا وَعَلَيْهِ مَا عَلَيْنَا ) واتە: (هەر کەسێك نوێژمان لەگەڵدا بکاتو ڕوو بکاتە ڕووگەکەمانو لەسەربڕاومان بخوات، موسوڵمانەو هەموو ئەو مافانەی هەیە، کە ئێمە هەمانەو هاوکات ئەو ئەرکانەشی لەسەر شانە کە لەسەر ئێمەیە)؟

هەیاسی خاس گوتی: ئەی ئەبو سەعید خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴾ البقرة: ٢٨٢،

واتە: لە کەسانێك، کە لە شایەتیان ڕازین.. ئەم کەسەش لە وانەیە کە لێیان ناڕازین..

هەیاس زۆر بەوردی لە چەمکی دادوەری تێگەیشتبوو، بەشێوەیەك کە بۆ هەموو کاتو شوێنێك، بۆ هەموو کەسێك دەستوورو یاسایەکی تایبەتی هەبوو، مرۆڤەکانی وەکوو دەروونناسێك، دەخوێندەوەو کەس نەیدەتوانی لە بیرتیژیو لێهاتووییەکانی هەیاس دەربچێتو بتوانێت بەئاسانی مافی کەسێك بخوات.

هەیاس دادوەرێکی لێهاتوو بوو، خاوەنی تێگەیشتنێکی قووڵ بوو، بوێرو چاونەترس بوو، شایەتی هەر کەسێکی ڕەت دەکردەوە کە لێی دڵنیا نەبووایە، ئەگەرچی حاکم، یان والیو کاربەدەستی شار، بوبێت، شایەتییەکەی بوێرانە ڕەت کردۆتەوە، ئەگەر لە شایەتییەکەی دڵنیا نەبوبێت.

# حیکمەتی گەورەبوون!

لە فارسییەوە: جووتیار نەریمان

پیاوێك چووە لای حەكیمێكی چینی، ئەوێ دەمێ لە گوێ چەمێ، مەراسیمی دینیی بەجێ دەهێناو بێدەنگ دانیشتبوو. دانیشت، چاوەڕوانی كرد؛ تا حەكیم لە عیبادەت بوویەوە. پاش سڵاوو ڕێز، داوای لێ كرد؛ فێری زانستی بكات. پیرە حەكیمی دنیادیو، دەستی دایە گاڵۆكەكەی و لەسەر لمی كەناری چەمەكە خەتێكی كێشا، پاشان گوتی: دادەی ئەو هێڵەم بۆ بكە بە نیوە، بزانم بۆ شاگردی دەشێیت! كابرای فێرخواز، گورج نیوەی هێڵەكەی سڕییەوەو هەر لە كورتی بڕییەوە، گوتی فەرموو، ئەوەتا كردم بە نیوە. حەكیم گوتی: بڕۆ! كەڵكی نییە؛ شاگردم بیت، تا ساڵێكی تر نەتبینمەوە. دەق، پاش ساڵێكی ڕەبەق، فێرخواز گەڕایەوە لای حەكیم، هەر وەكوو پار، گوتی هاتووم ببمە خوێندكار. حەكیمی داناو زانا، وەك ساڵی پار، هێڵێكی كێشا، هەمان داوای دووبارە كردەوە، فێرخوازیش هەر وەك جاری پێشوو، نیوەی هێڵەكەی سڕییەوە. حەكیم دیسان گوتییەوە: بڕۆ! تا ساڵێكی تر نەیەیتەوە. ئەمجارەیان، پاش تێپەڕینی ساڵێك، فێرخوازەكە هاتەوە، وەك جاری پێشوو، هەمان شت دووپات بوویەوە. كە پیرە حەكیم هێڵەكەی كێشاو داوای كرد فێرخواز بیكات بە نیوە، فێرخواز گوتی: گەورەم! زانای مەزن! من نازانم، خۆت بۆم بكە بە نیوە. حەكیمی شارەزاو زانا، دەستی دایە گۆچانەكەی، لە تەنیشت ئەو هێڵەوە، هێڵێكی تری كێشا، كە دوو هێندەی هێڵی یەكەم درێژ بوو. ئنجا گوتی: سەرنج بدە! هێڵێ یەكەم، بووە بە نیوەی ئەم هێڵە. فێرخواز گوتی: گەورەم ڕازو نهێنی ئەمە چییە؟ حەكیم گوتی: ئەگەر گەرەكتە زاناو داناو گەورە بیت، دەبێت لە پێشدا بزانیت، كە بە سڕینەوەی خەڵكی، هیچت نابێت بە هیچ. ئەگەر دەتەوێت لە خەڵكی گەورەتر بیت، هەوڵی سڕینەوەو بچووككردنەوەی كەس مەدە، بەڵكوو خۆت دوو هێندەی ئەوان‌و زیاتر گەورە بەو هەوڵ بدە، ئەو دەمە هەر بەڕاستی ئەوان، بێئەوەی بچووك ببنەوە، دەبن بە نیوەی تۆ، بەڵام بە سڕینەوەی ئەوان، خۆت هەر لە جێی خۆت دەمێنیت‌و وزەی ئەوانیش بەفیڕۆ دەدەیت. نە وزەی ئەوان بە كەم بگرە، نە خۆیشت سەرقاڵی خەڵكی بكە. زۆربەمان، ئەوەمان لە ژیانی خۆماندا هەست پێ كردووە، كە كەسانێك هەوڵ دەدەن بە بچووككردنەوەی خەڵكی، خۆیان گەورە نیشان بدەن. ئەوانە هەرگیز گەورە نابن‌و هەر بە دەردی گرگنیی خۆیانەوە دەتلێنەوە. چەند خۆشە هەموومان فێری حیكمەتی گەورەبوون ببین‌و سەرقاڵی خۆمان بین، نەك خەڵكی.



# دیارییەکەی باوکم!

سایە سەرگەتی

هەمیشە دیارییەکانت کاریگەریی گرنگی لە ژیانم هەبووە، باوکە گیان بیرتە، کاتێ دیارییە بەنرخەکەت بۆ هێنام، چەند بێئەزموون بووم، چەندە بەهێمنی تۆو دایە گیان، لەگەڵ دیارییەکە ئەزموونتان فێرکردم، ئارەزووی سەرکەوتنو سەرکردایەتیتان لەناخی مندا درووست کرد. کاتێك ئێوەم بەجێ هێشت، منتان دا بەدەست خوداو چاوەڕێی ئەنجامی پەروەردەکردنی چەند ساڵتان بوون، ئامۆژگاریتان کردم، هەرگیز دیارییەکە لەبیر نەکەم، پێتان فەرمووم، کە بخوێنمەوە، فێرتان کردم کە بەزانستەوە خودا بناسم، چونکە لەخوداترسەکان زاناکانن. من ئێستەش، دوای هەشت ساڵ لە تەمەنی دیارییەکەتان، بەردەوامم، لەگەڵ دیارییەکە بەسەرەتای زۆربەی خەونەکانم گەیشتووم. دەمەوێت سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتن بەدەست بهێنمو لەگەڵ خۆم دیارییەکەش بەرەو لوتکە ببەم، هەردوو چاوەکانم، دیارییەکەتان بوەتە بەشێك لە خەونەکانم، وا دەبینم ئەگەر پەیامەکانی دیارییەکە سەرکەوتوو بن، منیش سەرکەوتوو دەبم، وا بزانم تائێستە بۆم باس نەکردوون، کە من زۆربەی پلانەکانم بۆ مەزن بوونی دیارییەکەتان شکستی هێناوە، بەڵام هیچ کات ناوەستم، ئێمە پێکەوە سەردەکەوین. باوکە گیان، ئەوکاتەی کە گۆڤاری بڕیارت بۆ هێنام، وەك جوانترین دیاری، لای خۆم تۆمارم کردو بە هەموو هاوڕێکانم ناساند، وتەکانی بڕیار وەك خوێن بەنێو دەمارەکانمدا هاتوچۆیان دەکرد، کاتێ ئاگادارتان کردمەوە، بەژداری ئەو خولانە بکەم، کە گۆڤاری بڕیار سەرپەرشتی دەکات زۆر ترسام، وام زانی وەك هەموو ئەو کتێبانەی کە سەرسامیان بوومو بەبینینی نووسەرەکانیان هیچ سۆزێکم بۆیان نەما، خۆشەویستیم بۆ بڕیار کەم دەکات، بەڵام زۆر بەپێچەوانەوە، کاتێ چاوم کەوت بە بەڕێزان سەرنووسەرو بەڕێوەبەری نووسین، بۆم ڕوون بوویەوە، بڕیار تەنها گۆڤارێك نییە، بڕیار قوتابخانەیەکە، ئەو قوتابخانەیەی کە دەبێ هەموو گەلێکی خاوەن بڕیار، بەشێك لە تەمەنی قوتابی بێت لێرە. خۆزگە دەمتوانی بڕیار بە هەموو کەسێك بگەیەنم؛ تا تەواوی گەلەکەم بەعیشقەوە ژیانیان بەسەر بردایە، تا هەموان سەرکەوتوو بوونایە، دەبینی باوکە گیان، منو بڕیار چەند خەونەکانمان لەیەك دەچن، ئامانجمان گەلێکە، خاوەنی بڕیار بێت، خەونمان گەلێکی خۆشبەختە، دەزانم ژمارەی هاوئامانجەکانمان زۆر کەمە، بەڵام خۆشەویستانم، دڵنیابن داهاتوو بۆ ئێمەیە، بۆ ئەو کەسانەی کە بەبێ شەڕ، گەورەترینو هێمنترین پەیام بە گەلەکەیان دەگەیەنن، داهاتوو بۆ ئەو کەسانەیە، کە شەوو ڕۆژ دەخەنە سەریەك، تا پەنجەیەکی گەلەکەیان بریندار نەبێت، بەپشتیوانی خودا، داهاتوو بۆ تۆیە دیارییەکەی باوکم، گۆڤاری بڕیار، گۆڤاری سەرکردەکان.



جەلال عەبدوڵڵا حاجی



# نەوتو (ژینگە، کۆمەڵگەو مافی مرۆڤ)

## بەشی دووەم

لە پیشەسازی نەوتدا، گرفتی ژینگەیی بە کردارێکی جەوهەری دادەنرێت، هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ئەم پیشەسازییە، کاریگەریی خۆی هەیە لەسەر ژینگەو تەندرووستیی گشتی، کاریگەری لەسەر هەموو ناوەندە ژینگەییەکان دادەنێت؛ خاك، هەوا، ئاو. قۆناغەکانی گەڕانو دۆزینەوە، هەڵکەندنو گواستنەوە، هەریەکێکیان کاریگەریی خۆی هەیە، بەڵام ڕادەی ئەو زیانەی لێی دەکەوێتەوە، بەپێی ژینگەی ناوچەکە، کۆمپانیاکانی نەوت، چاودێریی حکومەتو چالاکی ڕێکخراوە ژینگەییەکان دەگۆڕێت.

**گەڕانو هەڵکەندنو دەرهێنانی نەوت:**

پێش ئەوەی نەوتو گاز بگەنە سەر ڕووی زەوی، کاریگەرییان دەست پێ دەکات، واتە: لە قۆناغی گەڕانو دۆزینەوەدا، بەزۆری کێلگەی نەوتو گاز لەو ناوچانەدا دەدۆزرێتەوە، کە بەردەکەی نیشتەنی کردە، لە قۆناغی گەڕاندا تەکنیکی لە ڕازاندنەوەی بەرز بە شێوەی جۆراوجۆر بەکار دێت، بۆ دەستنیشانکردنی شوێنی کۆبوونەوەی یەدەگی نەوت، لەژێر ڕووی زەویدا. هەرچەندە ئامێری زۆر هەستیار بەکار دێت لە دوورەوە، بە بەکارهێنانی فڕۆکە، یان کەشتی ئاسمانی، بۆ دۆزینەوەی یەدەگی نەوت، بەڵام ڕێژەی سەرکەوتنی ئەم تەکنیکە، سنووردارە.. ئەمە وای کردووە پەنا ببرێتە بەر ئامێرەکانی پشکنینی سەر ڕووی زەوی، هەرچەندە لە ڕووی ژینگەییەوە، باش نییە.

تەکنیکی گەڕانو پشکنین لەسەر ڕووی زەوی، ئاسانتر شوێنی یەدەگی نەوت دەستنیشان دەکەن، بە بەکارهێنانی شەپۆلی لەرەلەربەرز، بە سوودوەرگرتن لە ئامێری گەڕان بۆ نەوت (عربات الصدم)، هەروەها بەکارهێنانی تەقەمەنی، بەکونکردنی زەویو ئەنجامدانی تەقینەوە لەژێر ڕووی زەویدا، یان بەکارهێنانی تۆپی هەوایی (المدافع الهوائية)، کە تایبەتە بە ناوچە دەریاییەکان، لەگەڵ ئامێری قورسی تر، ئەم ئامێرانە بەشێوەی چەندبارەو بەردەوام بەکار دێن، بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە دوورەدەستنو ژینگەکەیان هەستیارە.

کاری هەڵکۆڵینو گەڕانی فراوان، تا ئێستا بەکار دێت، بەتایبەت لەو وڵاتانەی تازە گەشە دەکەن، بڕی یەدەگی نەوتی دۆزراوە، لەئاستی پێویستدا نییە، ئەم کردارە زیانی زۆری هەیە بۆ ژینگەی ئەو ناوچەیە، کە هەڵکەندنی تێدا ئەنجام دەدرێت، بەمەبەستی بونیادنانی ژێرخانی پێویست، لەگەڵ درووستکردنی ڕێگا بۆ شوێنی یەدەگی نەوت، کە دەبێتە هۆی تێکدانی ژینگەی سرووشتی، هەروەها ڕێخۆشکەرە بۆ بڕینەوەی دارستانەکان. لەکاتی دەرهێنانی نەوتو گازدا، بەزۆری کاریگەرییە ژینگەییەکانی قۆناغی گەڕان پشتگوێ دەخرێت.

لەپاش قۆناغی گەڕانو دۆزینەوە، قۆناغی درووستکردنی کێلگەی نەوت دەست پێ دەکات، کە پێکدێت لە هەڵکەندنی چەند بیرە نەوتێك، ئینجا دەست دەکرێت بە کرداری دەرهێنانی ڕاستەقینە، بەزۆری نەوت بڕێکی باش، گازی سرووشتی لەگەڵدایە، پێکەوە دێنە دەرەوە بۆسەر ڕووی زەوی.

نەوتی خاو، لەگەڵ بەرهەمە دووەمییەکانی کرداری هەڵکەندنو دەرهێناندا، بڕێکی زۆر مادەی ژەهراویو مادەی زیانبەخشیان تێدایە بۆ ژینگە، لەماوەی کرداری بیرلێداندا بڕێکی زۆر وردەبەرد دێتە سەرەوە، کە بەشێکی گەورەی پاشەڕۆی هەڵکەندنەکە پێك دەهێنێت، پێویستە لەناو ببرێتو دوور بخرێتەوە، وردە بەردەکان بە شلەی بەرهەمی هەڵکەندنەکە داپۆشراون (قوڕی هەڵکەندن)، کە بۆ چەورکردنو ئاسانکردنی نوکی بیرلێدەرەکە بەکاردێت، لەهەمانکاتدا هاوسەنگی پەستانی بیرەکە دەپارێزێت، قوڕە بەرهەمهاتووەکە، مادەی زیانبەخشی تێدایە، وەك مادە قورسەکانو مادە کیمیاییە ژەهراوییەکان، بڕی وردەبەردو قوڕی بەرهەمهاتووی تەنها بیرێك، لەنێوان (٦٠ - ٣٠٠) هەزار گالۆندایە لەڕۆژێکدا.

بڕێکی زۆر ئاو دێتە سەرەوە، مادەی تواوەو هەڵواسراوی تێدایە، کانزا قورسەکانی وەك قورقوشم، توتیاو جیوەی تێدایە، لەگەڵ ئاوێتەی ئۆرگانییەکانی (وەك بەنزینو تۆلوین)، لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر خوێ، لەکاتی ڕۆکردنی ئەم مادە زیانبەخشانە بۆ ناو ژینگە بەشێوەیەکی نابەرپرسانە، ڕەنگە ببێتە هۆی زیانی گەورە بۆسەر دانیشتوانی ناوچەکەو گیانلەبەرانو ڕووەك، هەندێجار بیرلێدانەکە دەبێتە هۆی پیسکردنی ئاوی ژێر زەوی ناوچەکەش. بۆئەوەی ئاوی ژێر زەوی پیس نەبێت، باشترین چارەسەر بیرلێدانی ناوپۆشکراوە (حفر المبطنة)، هەروەها خاوێنکردنەوەو پاڵاوتنی ئاوی بەرهەمهاتوو، لەگەڵ چارەسەرکردنی بایۆلۆجی، پێش ئەوەی بکرێتە ژینگەوە، دەتوانرێت سوود لەو ئاوە وەربگیرێتەوە، دووبارە بکرێتەوە ناو زەوی بۆ دابینکردنی پەستانی پێویست بۆ دەرهێنانی نەوت.

سەرچاوە: کتێبی(الرقابة على النفط –دليل الصحفي فى مجال الطاقة والتنمية- التخلص من لعنة الموارد)- ريفينيو وتش-معهد المجتمع المنفتح.



# ڕیچارد برانسۆن (١٩٥٠ - ٠٠٠٠)

## لە گۆڤاری قوتابیانەوە بۆ گەشتی ئاسمانی:

**هیوا لە منداڵییەوەیە:**

ڕیچارد چارلز نیکۆلاس برانسۆن لەساڵی ١٩٥٠ لە ئینگلتەرا لەدایك بووە، لە باوکێك کە کاری پارێزەری دەکردو وانەی فێربوونی فڕۆکەوانی دەخوێند.

ڕیچارد برانسۆن پەیوەندیی کرد بە قوتابخانەی (ستوا)وە، بەڵام برانسۆنیش وەکوو ئەو کەسانەی کە لە قوتابخانە سەرکەوتوو نەبوونو ڕوویان کردۆتە کارێکی دیکەو توانیویانە سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بهێنن، لە تەمەنی شانزە ساڵیدا، واز لە قوتابخانە دەهێنێت بەهۆی ئەوەی کە نەیدەتوانی پرۆگرامەکانی خوێندن بەباشی بخوێنێتەوەو لێیان تێ بگات، بەشێوەیەك چەند کاتژمێرێکی پێ دەچوو؛ بۆئەوەی بابەتێك وشە وشە لەبەر بکات، پلەی زیرەکی زۆر نزم بوو، مامۆستاکانیشی پێیان وابوو کە ڕیچارد برانسۆن فێرخوازێکی زیرەك نییە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ڕیچارد برانسۆن، هەست بەشەرمەزاری بکات لەناو هاوپۆلەکانیدا، لەبەرئەوە وازی لە قوتابخانە هێنا، بەڵام هاوکات توانای خۆگونجاندنو پەیوەندیی لەگەڵ دەوروبەردا لە ئاستێکی بەرزدا بوو.. یەکەم کارێك کە دەستی پێ کرد بریتی بوو لە گۆڤاری (قوتابی- ستیودنت) بۆ لاوانی دامەزراند.

ڕیچارد برانسۆن لە ساڵی ١٩٦٨ لە کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبوون لەگەڵ تیمەکەی ستیودنتی ڕاوێژکاری ژیاوە، بۆ پێشکەشکردنی ڕێنماییو پرسو ڕا بۆ ئەو کەسانەی بەدەست گرفتێکەوە دەناڵێنن.

دوای چوار ساڵ لە دامەزراندنی گۆڤارەکەی، دەستی کرد بە فراوانکردنی کارەکەی، سەرەتا تۆمارگایەکی کردەوە بۆ فرۆشتنی کاسێتو.. هتد، بە ناوی (ڤیرجین- **Virgin**) کە یەکەم جۆر بوو لە جیهاندا لەو بوارەدا بکرێتەوە، کە پشتی دەبەست بە گەیاندنی داواکاری کڕیار لە ڕێگەی پۆستەوە، توانی لەو بوارەدا سەرکەوتنێکی ناوازە بەدەست بهێنێتو سەروەتێکی باش دەست بخات، ئەوەشی لە خزمەتی فراوانکردنی کارەکەیدا بەکار هێنا، کۆمپانیاکەی برانسۆن بەردەوام لە گەشەسەندنو فراوانبووندا بوو، ساڵی ١٩٨٤ ڕیچارد جگە لە ڤیرجین، کۆمپانیایەکی دیکەی بەناوی (ڤێرجین ئەتلانتیك)ەوە تایبەت بە هێڵی ئاسمانی دامەزراند، کە یەکەمجاری بوو بچێتە نێو جیهانی فڕۆکەوانییەوە، کۆمپانیاکەی بووە خاوەنی خزمەتگوزارییەکی ناوازەو دابەزاندنی نرخ لەبەرژەوەندیی هاوڵاتی، کە دواتر کۆمپانیاکانی دیکەش بەناچاری نرخیان دابەزاند.

دوای دوو ساڵ لە کردنەوەی یەکەم کۆگای بازرگانی، بەناوی (فیرجین)ەوە بۆ فرۆشتنی قەوان، لە لەندەن دامەزراند، هەر لەو ساڵەدا دوورگەیەکی کڕی بە بڕی ١٨٠٠٠٠ جونەیهی ئیستەرلینی، بۆ پشوودانو حەوانەوەو کەیفو سەفا نا، بەڵکوو بۆ پەرەپێدانو گەشەسەندنی کارەکەی بەکاری هێنا، هەروەها کارو چالاکییەکانی تێدا ئەنجام دەداو بڵاوکردنەوەی تۆمارەکانی بەرفراوانتر کرد.

کاری بازرگانی، هەمیشە بردنەوەو قازانجکردن نییە، بەڵکوو هەندێجار بازرگانەکان دوچاری زەرەروزیان دەبن، برانسۆنیش ساڵی ١٩٨٢ دوچاری زیانێك هات، کە بە یەك ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی مەزەندە دەکرا، بەڵام (ڤیرجین) توانی ئەو زیانە پڕ بکاتەوە، بە واژۆکردنی گرێبەستێك لەگەڵ چەند لایەنێکی پەوەندیدار، لەوانە (بوی جۆرج، فیل کولینز، سیمبل مانیدس، ژی هومان لیگ).

- ساڵی ١٩٨٦ بەلەمەکانی فیرجین ئەتلانتاك بەخێرایی ١١ ئەوەندە بە تێپەڕین لە زەریای ئەتڵەسی، تەنها بە ماوەی سێ ڕۆژو هەشت کاتژمێرو سیو یەك چرکە، ئەم بڕینەی بەلەمەکانی ڤیرجین لە کاتێکدا دێت، کە پێش ئەو هەوڵی بەلەمێك بۆ بڕینی ئەو ماوەیە، نەك هەر شکستی هێنا، بەڵکوو بەلەمەش نقوم بوو، نەیتوانی جگە لە شەست میل بەولاوە بڕوات.

لە ساڵی ١٩٩٣، چووە نێو سەرکێشییەکی گەورەوە، کە بریتی بوو لە کارکردن لە بواری هێڵی ئاسنیندا، برانسۆن توانی سەرکەوتنێکی دیکە لەم بوارەدا تۆمار بکات، بە دانانی هێڵی ئاسنین لە نێوان شارە کەناراوەکانی ڕۆژئاواو تێپەڕبوونی بە هێڵی ئاسنینی بەریتانی..

ڕیچارد بە تەنها ئەم سێ کۆمپانیایە لە گەشەکردنو بەرەوپێشچوون نەوەستا، بەڵکوو بەردەوام بوو لە گەشەپێدانو فراوانکردنی کۆمپانیاکانی، تا بوو بە خاوەنی گرووپی کۆمپانیاکانی ڤیرجین، دەزانیت ئەمڕۆ گرووپی کۆمپانیاکانی ڤیرجین، ژمارەیان چەندە؟

ئەگەر زانیاریت لەبارەیەوە نەبێت، ڕەنگە نەتوانی بەئاسانی مەزەندەی بکەیت! گرووپی کۆمپانیاکانی ڤیرجین، ئەمڕۆ زیاتر لە ٣٠٠ کۆمپانیایەو لە ٣٠ دەوڵەتی جیهانیدا لقی هەیە، لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا کاردەکەن، لەوانە: (پەیوەندیکردن، گەشتوگوزار، خزمەتگوزاریی دارایی، کات بەسەربردنو خۆشی، بازرگانیی بەش بەش، فریاگوزاری لەکارکەوتنو چەندین بواری دیکە)، ژمارەی کارمەندەکانی گرووپی کۆمپانیای ڤێرجین، نزیکەی پەنجا هەزار کارمەندە.

ڕیچارد عەقڵە بازرگانییەکەی بەردەوام بوو، لەکارکردن، قازانج لەکوێ بوو، پەنجەی لەوێ دادەنا، هەر کارێك لە بەرژەوەندیی کۆمپانیاکەی بوو،

به بیرێکی فراوانەوە ئەنجامی دەدا، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩٢ ریچارد مارکەی (ڤیرجین- Virgin) فرۆشت بە EMI بەرامبەر بە یەك ملیار دۆلار.

**بەکورتی گرنگترین دامەزراوەکانی ریچارد برانسۆن:**

* دامەزراندنی گۆڤاری (قوتابی- ستیودنت).

* دامەزراندنی تۆمارگایەك بۆ فرۆشتنی کاسێتو..هتد، بە ناوی (ڤیرجین- Virgin).

* ساڵی ١٩٨٤ ریچارد جگە لە ڤیرجین کۆمپانیایەکی دیکەی بەناوی (ڤێرجین ئەتلانتیك)ەوە تایبەت بە هێڵی ئاسمانی دامەزراند.

* ساڵی ١٩٩٣دا مەزراندنی کۆمپانیایەك تایبەت بە هێڵی ئاسنین.

* ساڵی ١٩٩٩ کۆمپانیای (ڤیرجین مۆبایلی) دامەزراند.

* ساڵی ٢٠٠٠ کۆمپانیای (ڤیرجین بلو)ی لە ئوسترالیا دامەزراند.

* لە ٢٥ ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٤ برانسۆن واژۆی رێکەوتنێکی نوێی راگەیاند بۆ دامەزراندنی کۆمپانیای گەشتوگوزاری، بەڵام ئەمجارەیان گەشت بۆ وڵاتانو سەرزەوی نا، بەڵکوو گەشت بۆ فەزا، بەناوی (ڤێرجین گالاکتیك)، هەروەها دروستکردنی کەشتیی ئاسمانی، لە تەنیشت تاکە کۆمپانیای ئەو بوارە مایکرۆسۆفت بەناوی (پۆل ئالن)، کەشتییە ئاسمانییەکەی لە لایەن ئەندازیاری بواری فرۆکەوانی ئەمریکایی (پێرت رۆتان)ەوە دیزاین کرا، ئەم کۆمپانیایە واتە: (ڤێرجین گالاکتیك)، پلانی دانا؛ بۆئەوەی لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٩ ئەو کەسەی دیەوێت گەشتێك بکات بۆ بۆشایی ئاسمان، بتوانێت بەئاسوودەیی ئەو گەشتە ئەنجام بدات، نرخی بلیتی گەشتەکەشی دیاری کردبوو، کە بری ٢٠٠٠٠٠دوو سەد هەزار دۆلاری ئەمریکی بوو. بە بەکارهێنانی ئەسپی سپی!

لە ٤ تەمموزی ساڵی ٢٠٠٦ برانسۆن، کۆمپانیای (ڤیرجین مۆبایل) ی فرۆشت، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها کۆمپانیای تەلەفۆنات (NTL/NTL Telewest)، بە نزیکەی یەك ملیار جونەیهی ئیستەرلینی، بەشێکیش لە گرێبەستەکە دەبێت کۆمپانیای بەرامبەر لانی کەم ساڵانە هەشت ملیۆنو نیو جونەیهی ئیستەرلینی لە بری بەکارهێنانی ناوی (ڤیرجین)، برانسۆنیش بووە گەورەترین خاوەن پشکی لە کۆمپانیاکە.

- لە ٢١ ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٦ برانسۆن پەیمانی وەبەرهێنانی ڤازانجی (ڤیرجین ئەتلانتیك)و (ڤیرجین بۆ شەممەنەفەر)دا، لە توێژینەوەیەکدا تایبەت بە هاورێی ژینگە، بە نرخی ٣ ملیار دۆلار.

- لە شوباتی ساڵی ٢٠٠٧ برانسۆن (بانکی ڤیرجین بۆ تەندرووستی) کە هەڵێك بوو بۆ کۆکردنەوەی خوێن بۆ منداڵانی تازەلەدایکبوو، خانە ریشەییەکان، بۆ پەتی ناوەکی، دوای لەدایکبوونی منداڵ.

- لە ٩ شوباتی ساڵی ٢٠٠٧ برانسۆن خەڵاتی زانستی جیهانی نوێی بۆ تەکنەلۆژیا دامەزراند بە ناوی (ڤیرجینو ململانێی زەوی).

برانسۆن لەوباوەڕەدا بوو، کە مێژوو ئەوەی سەلماندووە، کە ئەو جۆرە خەڵاتانە دەبنە هاندان بۆ پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا، لە پێناوی بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی، ئەو خەڵاتەی برانسۆن دای نابوو بۆ تەکنەلۆجیا، بری ٢٥ ملیۆن دۆلاری دەبەخشییە هەر تاکێك، یان کۆمەڵێك کە بتوانن دیزاینێکی بازرگانی درووست بکەن، کە ببێتە هۆی لابردنی گازە گەرمەکان لە بەرگەهەوادا، هەر ساڵێك، لانی کەم بۆماوەی دە ساڵ ئەو ماددە زیانبەخشە دوور بخاتەوە، بێئەوەی ئاسەواری خراپی لێ بکەوێتەوە، برانسۆن بەم پرۆژەیەی لە رووی داراییەوە بەشداری کرد لە بەدیهێنانی ئارامی کەشوهەوای سەر زەوی.

لە ١٠ کانونی ساڵی ٢٠٠٨ برانسۆن (ڤێرجین بۆ چاودێری تەندرووستی) راگەیاند، لەو چوارچێوەیەدا کۆمەڵێك بنکەی چاودێریی تەندرووستی کردەوە، هەروەها چارەسەری نموونەییو تەواویش بە نەخۆشەکان دەدا، کە لەلایەن پزیشکی پسپۆڕەوە دیاری دەکرا.

برانسۆن لە ساڵی ١٩٩٨ ژیاننامەی تایبەتی خۆی لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە، بەناوی (losing My Virginity)، کە زۆرترین فرۆشی هەبوو، ریچارد برانسۆن ژمارە ٢٤٥ لە لیستی دەوڵەمەندانی جیهاندا وەرگرت، بەپێی ئەو لیستەی کە لە گۆڤاری فۆربس بۆ دەوڵەمەندانی جیهان بڵاوکرایەوە.

سەروەتەکەی ریچارد برانسۆن نزیکەی ٣ ملیار دۆلارە..

**پوختە:** برانسۆن لە دەرکردنی گۆڤارێکەوە دەستی بە کارکردن کرد، کە ئەو کاتە تەمەنی تەنها شانزە ساڵان بوو، ساڵی ٢٠٠٦ ریچارد برانسۆن چووە ریزی دەوڵەمەندەکانی جیهانەوە، بەپێی ئامارێك کە لە رۆژنامەی سەندەی تایمز بڵاوکراوەتەوە، سامانەکەی گەیشتە زیاتر لە ٣ ملیار جونەیهی ئیستەرلینی.. ئێستا خاوەنی زیاتر لە ٣٦٠ کۆمپانیایە..

**٥ نهێنیی سەرکەوتنی ریچارد برانسۆن:**

کۆمەڵێك گۆڕانکاری ئابووری جیهانو تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، ئەمە ئەو گۆڕانکارییە بوو، کە کۆمپانیای ڤێرجین ئەنجامی داوە، سەرەتا کۆمەڵێك شوێنی بۆ تۆمارکردن دامەزراند، پاشان پێبەرکێی کرد بۆ چەند چێنێکی تەکنەلۆژیاو فرۆشتنی بەرهەمەکانی تۆمارگاکەی لە کاسێتو فیلمو بەرنامەی یاریو کتێبو چەندانی دیکە، هەروەها گۆڕینی ناوی کۆمپانیاکەی لە ڤیرجین تۆمارکردنەوە بۆ ڤێرجین میگاستور.

٢- بەردەوامبوونو تەرکیزکردن لە سەرکەوتنی کاری بازرگانیدا، لەم بارەیەوە برانسۆن ئامۆژگاریی بازرگانان دەکات، کە دڵنیا بن لە پێکهاتەی بنەڕەتیی کۆمپانیاکەیان، دابەشکردنی تیمی کارکردن کە گرنگی بە هەموو لایەنەکان بدەن، پاراستنی ئەو پەیوەندییەی هەیانە لەگەڵ دەوروبەر، هەر بۆ ئەم مەبەستە برانسۆن ساڵانە پێداگری دەکاتو بۆ بەشداریکردنی راهێنانی ساڵانەی کارمەندەکانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆ پاراستنو زیاترکردنی ئەو پەرۆشیو گڕوتینەیان کە هەیانە بۆ کارکردن، تا هانیان بدات بۆ گۆڕانکاریو پەرەپێدانییان لە کارەکانیاندا، دەتوانین ئەم خاڵە بە هۆکاری سەرکەوتنی برانسۆن لە قەڵەم بدەین کە توانیویەتی لە کاتێکی کەمدا ئەو ناوبانگە بەهێزە پەیدا بکات.

٣- نەترسان لە دەستبەرداربوون، یان دەستهەڵگرتن لە بەشێکی کارەکەت، ڕەنگە بۆ تۆ وەکوو خاوەن پرۆژەیەکی بازرگانی، ئەستەم بێت ئەم کارە بکەیت، بەڵام ئەگەر ئەم کارە پێویست بوو؛ ئەوا هەرگیز لە ئەنجامدانی دوودڵ مەبە، برانسۆن لە ماوەی چەند ساڵێکدا ژمارەیەك لە کۆمپانیاکانی فرۆشت، کە دیارترینیان فرۆشتنی تۆمارگەی ڤێرجین بوو بە EMI، لەپێناوی پارێزگاریکردن لە کۆمپانیای فرۆکەوانییەکەی، برانسۆن لەو بارەیەوە دەڵێت: ئەو رۆژە رۆژێکی زۆر ناسك بوو بۆ من، هۆن هۆن فرمێسکم هەڵدەوەراند، بەڵام دڵنیابووم کە بڕیارێکی ژیرانەم داوە، بە ئامانجی دابینکردنی دڵنیایی مانەوەو پەرەپێدانی گرووپی کۆمپانیاکانم، کە هاوکارم بوو لە وەبەرهێنانی نوێدا. (کەواتە: فرۆشتن لە پێناوی باشتر، نەك فرۆشتن بۆ وازهێنان لە کارکردنو شکستخواردن)!

٤- دامەزراندنی پرۆژەی بازرگانی پێویستی بە کەسایەتی بەهێز هەیە، بەڵام هەندێجار خاوەن پرۆژەکان مەیلیان بەلای شەرەنگێزی، یان تووڕەبووندا هەیە، چ لەگەڵ کرێکارەکانیان، یاخود رکابەرەکانیان، یان تیمی کارکردنیان، بەڵام هیچ کەس حەز ناکات مامەڵە لەگەڵ کەسایەتییەکی شەرەنگێزدا بکات، لەبەرئەوە پێویستە هاوسەنگییەك رابگریت، لە مامەڵەت لەگەڵ تاکەکاندا، برانسۆن دەڵێت: ئێمە لە گرووپی کۆمپانیاکانی ڤێرجین، سەرکەوتنمان بەدەست هێنا؛ لەبەرئەوەی مامەڵەمان لەگەڵ هەموان بەشێوەیەکی ئەرێنی بوو، نەك دوژمنکارییانەو دڵرەقانە!

٥- سەرەتای کاری بازرگانی پێویستی بە جەربەزەییو بوێریو داهێنانکاری هەیە، سەرمایەداریو ناوبانگو پەیوەندییە تایبەتەکان گرنگن، بەڵام پێویستە خاوەنکار هەلەکان بقۆزێتەوە، کاتێك برانسۆن هێڵی ئاسمانی ڤێرجین ئاتلانتیكو هێڵی ئاسمانی ڤیرجنی ئوسترالی دامەزراند، ئەندامانی ئەنجومەنی بەرێوەبەرایەتییەکەی بە گومان بوون لە سەرکەوتنی لەو بوارەدا، بەڵام برانسۆن ئەو هەلەی دەست پێوەگرت، نەیهێشت لە دەستی بچێت، ئەمڕۆ ڤیرجن ئاتلانتك ساڵانە خزمەتی زیاتر لە ٥ ملیۆن کەس دەکات، ڤیرجن ئوسترالیاش دووەم گەورەترین کۆمپانیای فرۆکەوانییە لە ئوسترالیا!



# پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێشەنگمانە:

# تۆ چ جۆرە باوکێکیت؟

ن: دکتۆر مستەفا ئەبوسەعد
و: خالید موحەممەد

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە زۆرینەی ئەم جۆرە لە باوك مەبەستیان نییە، بەم مامەڵەیەیان سووکایەتی بە بەرامبەرەکانیان بکەن، بەڵکوو پێیان وایە کە ئەمە باشترین ڕێگەو شێوازە بۆ پەروەردەی منداڵو بەتایبەت بچووکەکان، وا دەزانن ئەمە باشترین وێنەیە لە باوکی (پیاو)ی باش کە دەبێ لە بیری منداڵەکاندا بیکێشن.

بەڵام باوکی متمانەبەخۆبوو پێویستی بەم جۆرە شێوازە پڕ توندوتیژییانە نییە، تاکوو بەهۆیەوە پیاوەتی خۆی بسەلمێنێ، چەندین شێوازی پێشکەوتوو سەردەمیانە هەن، دیارترینیان پێغەمبەری ڕاستگۆو خۆشەویستمانە کەوێنەی نییە لە شێوازی مامەڵەی پڕ میهرو سۆزدا بەرامبەر منداڵان، ئەوەتا لە نوێژدایەو درێژەی بە کڕنووشی خۆیو هاوەڵەکانیدا تاکوو دڵی حەسەنو حسێن ڕابگرێت! ئەو جۆرە باوکانە لە کوێن لەگەڵ ڕەوشتی ئەو مرۆڤە دڵ ناسکە، نەك لەگەڵ منداڵەکانی بەڵکوو لەگەڵ خزمەتگوزارەکانی کە دڵنیامان دەکەنەوە لەوەی هەرگیز ڕەخنەی لێ نەگرتوونو هەستی بریندار نەکردوون!

**٥- وازهێنانو پاشگەزبوونەوە:** باوکی منداڵ!

(پێم وایە زیاتر ئامادەم؛ بۆئەوەی باوك بم، نەك هاوسەر!!)

(لەو کاتەوەی کە منداڵەکە لەدایك بووە، من هاوڕانیم لەگەڵ خێزانەکەم؛ چونکە ئەو بیر لە کەس ناکاتەوە تەنها منداڵەکە نەبێت، بەڵام بەلای ئەوەوە، هەر دەڵێی بوونیشم نییە!).

ئەمە زمانی جۆرێکە لە باوك کەناوی (باوکی منداڵ)مان لێ ناوە، ئەوانیش دوو بەشن:

**١-غیرە دەکات لە دایك:** ئەم جۆرە دەیەوێت، منداڵەکە بۆ خۆی بێت، حەز دەکات هەمیشە لە باوەشیدا بێت، تووشی غیرە دەبێت، کاتێك دەبینێت منداڵەکە حەز بە باوەشی دایکی دەکات، وەك لە باوەشی ئەم، ئەمەش لەو کاتەوە دەردەکەوێت، کە منداڵ لە باوەشی باوکیدا دەگری بەڵام کە چووە لای دایکیو بەسنگیەوە نا ژێر دەبێتەوە..

**٢-غیرە لە منداڵەکە دەکات:** ئەم جۆرەیان دەیەوێت خێزانەکەی، هەمووی بۆخۆی بێتو زیاتر گرنگی بەم بدات، نەك منداڵەکەی، زۆر غیرە دەکات کاتێك دەبینێ خێزانەکەی تەواوی گرنگییەکانی دەدات، بە منداڵە نوێیەکە.

**(باوکی منداڵ) کێیە؟!**

ئەم جۆرە بەهەردوو بەشەکەیەوە دەناڵێنێ، بەدەست کەمی لە بواری سۆزداریو پێداویستییەکی دەروونی بۆ نەرمیو خۆشەویستی، ئەم جۆرە نوێنەرایەتیی ئەوانە دەکەن، کە هەلی پێگەیشتنو بڕینی قۆناغەکانی منداڵییان بۆ نەڕەخساوە، یەکێك لە نیشانەکانی حەزی دەست بەسەراگرتنو قۆستنەوەی هەموو شتێکە، کە خۆشی دەوێت، ئەوان زۆر باشن، باشییەکەیان وێنەی نییە، بەڵام لەڕووی دەروونییەوە ئامادەنین، بۆ کارو ئەرکی باوکایەتی، زۆربەی کات دەبینی بێزارنو ڕازی نینو ئارامو بەختەوەر نین لە ژیانی خێزانیدا)..

هەندێك لەم جۆرە باوکانە، پەنا دەبەنە بەر گرنگیدانێکی زیاد لە پێویست بە منداڵەکانیان، تاکوو بێتوانایيان لە ئەنجامگەیاندنی کاری باوکایەتی پێ بشارنەوە، یەکێکیان دەبینی دەیان هیوایەتو یاری دەهێنێتە پێشەوە بۆ سەرقاڵکردنی منداڵو زیادەڕۆیی

دەکات لە شوێنپێهەڵگرتنی منداڵەکەیو لاساییکردنەوەی، وەك منداڵەکان یاری دەکات، ئەوەی لەبیر کردووە کە یاریکردنی منداڵ کارێکی بنەڕەتییە، بەڵام بۆ گەورەکان باسەکە جیایە.

### لەپێناو بەرهەمهێنانی باوکێکی بە ئاگاو کارا:

١- وەك باوك ئامانجەکانی خۆت بزانە... پێویستە چوارچێوەی ئەو وێنەیە بزانی کە پەیوەندیی نێوان تۆو کوڕەکەتی دیاری کردووە، دەتوانی چی بکەی؛ بۆئەوەی ئەو وێنەیە بکەیتە واقع، گرنگی بدە بە ئامانجی درێژخایەنو هەندێکی تریش کورت خایەن.

٢- ئەم دەستەواژەیە با هەمیشە لەپێش چاوت بێ:

(پەیوەندیم بە منداڵەکەمەوە (منداڵەکانمەوە) زۆر جێی گرنگی پێدانمەو بەلامەوە گرنگە، هەموو ئەوەی کە دەیکەمو دەیڵێم لە هەمان ئاستی گرنگیدایە؛ بۆئەوەی ئەم پەیوەندییە سەرکەوتوبێت).

دەتوانی ئەم دێڕە بنوسیتو لە جێگەیەکدا دای بنێیت، کە بتوانی سەرەتای هەموو ڕۆژێك بیبینیتو ئەمەش هاوکاریت دەکات بۆ بە بیرهێنانەوەی ئەو گرنگیدانەی کە بڕیارت داوە لە ڕێیەوە مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانت بکەیت.

٣- داوا لە خوای گەورە بکە هاوکاریت بکات، لە چۆنێتیی پەیوەندیو مامەڵەت لەگەڵ منداڵەکانت.

٤- پێویستە لەخۆت بپرسی: ئەمڕۆ چی بکەم؛ تاکوو بالانسی پەیوەندیم لەگەڵ منداڵەکانم زیاد بکەم؟

٥- سووربە لەسەر ئەوەی بەخۆت بڵێیت: (تۆ ئێستە ڕۆشنبیرتری وەك باوك) دەستەواژەیەك لەسەر ئەم مانایە دابڕێژەو هەوڵ بدە سەرەتای هەموو ڕۆژێك بەخۆتی بڵێیتو لە نێوەندی ئەو ڕۆژەدا چەند جار توانیت بیخوێنەوە: (من ڕۆژ بە ڕۆژ هۆشیارتر دەبم) یان (من بیردەکەمەوە پێش ئەوەی قسە لەگەڵ منداڵەکەم بکەم) تەنانەت ئەگەر ئەو دەستەواژەیە ڕاستەقینەش نەبێت، پێویستە بەخۆتی بڵێیت، وەك ئەوەی کە واقعییە، تاکوو بەڕاستی دەبێتە واقع.

٦- هەوڵ بدە پێش خەوتن چەند خولەکێك لەتەنهایی بۆ خۆت مسۆگەر بکەیت تاکوو تێییدا بیرت نوێ بکەیتەوەو بحەوێیتەوە، چەند هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژیتو بە وتەو کردارو هەڵوێستەکانتدا بچیتەوە، ئەمە هاوکارییەکی باشت دەکات.

٧- داوا لە منداڵەکانت بکە بیروبۆچوونەکانی خۆیانت پێ بڵێنو جەخت لە باشییەکان بکەرەوە (چی بکەم وا هەست بکات، یارمەتیم دەدات؟) یان (چی کارێك بکەم، ئەو بە گەورەی بزانێت؟).

٨- زۆر بەباشی گوێ بۆ منداڵەکانت بگرەو وتەو تێبینییەکانیان بەهەند وەربگرە.

٩- تەنها وەرگرتنی تێبینییەکانیان بەس نییە، بەڵکوو بەکرداری لەگەڵیاندا بەو بەشداربە لە دەرخستنی نهێنییەکانی جیهانی دەوروبەریان.

١٠- گرنگی بدە بە خوێندنەوەی کتێبی منداڵان، سوور بە لەسەر بینینی فیلمی تۆمارکراوی تایبەت بە ئەوان، بەشداربە لەگەڵیاندا لە یاریکردنیانداو بەیەکەوە چێژ وەرگرن.

١١- گەر لەپڕ جامی تووڕەییت ڕژاند، سوور بە لەسەر ئەوەی بۆ جارێکی تر چەند شێوازێك بگریتەبەر کە زیاتر فێری خۆڕاگریت بکات، (پێدەچێ لێرەدا نووسینی بیرۆکەو نیەتەکانت) سوودیان هەبێت، هەستکردنت بە گوناه بقۆزەرەوە تاکوو هاوکاریت بکات، لە گۆڕانکاری ئاکارتو مەیکەرە هۆکارێك بۆ چۆکدادانو تەسلیمبوون، یان ڕووخانو لاوازی.

١٢- گرنگی بدە بە نووسینەوەی ڕۆژانەکانت، چەند ساتێك بدزەرەوە بۆخۆت تاکوو تێیدا بتوانیت بنووسیت، (تۆمارکردنی ڕۆژانە باشترین هۆکارە بۆ دەربڕینی هەستوشعور، کاردانەوەو ترس، هەروەك بەسوودە لە تۆمارکردنی ڕووداوو دیاریکردنی کاتی کارە سەرکەوتوو پێشکەوتنەکان).

١٣- چەند کاتێك تەرخان بکە بۆ بیرکردنەوە لەو شتانەی کەپێویستە خودی خۆتی پێببەخشی.

١٤- گرنگی بدە بە جەختکردنەوە لەو دەستکەوتانەی بەدەست هێناوەو سەرکەوتوو بوویت، یان بەباشی بە ئەنجامت گەیاندوون، ئەو کارانە بنووسە لە دەفتەری ڕۆژانەتداو ئاماژە بە بەروارەکەیان بدە، خۆت ماندوو مەکە بە هەڵسەنگاندنی سەرکەوتنەکانت، ئەوەی لەسەرتە تەنها ئەوەیە جەخت بکەیتەوە لە کردارە باشەکان.

### لە بیرت بێت:

زۆر ئاسانە وەك ئامێرێك ئەو ڕێگەو شێوازانە جێبەجێ بکەیت، کە ڕاهاتویت لەسەریان، بەتایبەت گەر تۆ بەڕۆژێکی دوورودرێژو پڕ کێشەو هەڵوێستی جۆراوجۆردا تێپەڕبوویت، بەڵام چەند هۆشیاریت زیاتر بێت لە مامەڵەتدا شوێنەوارەکانی دیار دەبێتو کاریگەری دەبێت لەسەر باشترکردنی پەیوەندییەکانو پتەوکردنیان لەگەڵ منداڵەکەت، هەروەك باوەڕت بە توانای گۆڕانکاری لە ژیانتدا زیاد دەکاتو ئەمەش هاوکاریت دەکات لەوەرگرتنی بڕیاری باشترو بەهێزتر.

# خزمەتی دایکم!

زەینەب سەعید

ماوەیەك لەمەوبەر، وادەیەکم لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانم دانا.. بۆئەوەی بچم بۆ سەردانی ماڵیان. پاش ئەوەی بەڕێ کەوتمو گەیشتمە بەر دەرکی ماڵی هاوڕێکەم، زەنگێکم بۆ مۆبایلەکەی لێ دا؛ بۆئەوەی بێت بەدەممەوە.. منیش لە ئۆتۆمبیلەکەمدا، چاوەڕێم دەکرد.. لەناکاو ئۆتۆمبیلێکی کۆن لە جۆری کراسیدا، لە بەردەممدا ڕاوەستا، دوو گەنج لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزین.. بە شێوازێکی زۆر جوان پیرێژنێکی پەککەوتەیان هەڵگرت.. دەتگوت لەسەر کورسی هەڵگیراوە.. سەیری پیرێژنەکەم کردو گوتم: ئای خودایەگیان چەندە چاکیت، کە ئەم دوو کەسەت بۆ ئەو پیرێژنە ڕەخساندووە.. ئەو پیرێژنە وەکوو شاژنەکانی زەمانی زوو وابوو، کە لەسەر تەختی ڕەوان، بە شانو ملی کۆیلەکانەوە بوون.

هاوڕێکەم هات بە پیرمەوەو ئەوەی کە بینیم بۆم باس کردو گوتی: ئەوانە دراوسێمانن. بەسەرهاتەکەیانت بۆ باس دەکەم.. بەسەرهاتو چیرۆکێکی زۆر سەیرە!

هاوڕێکەم گوتی:

ڕۆژێکیان دوای ئەوەی نوێژی عەسرم ئەنجامداو زوو لە



مزگەوت هاتمە دەرەوە، چاوەڕێی هەندێك میوانم دەكرد، كە لە شارێكی دیكەوە دەهاتن، لەبەرماڵەكەماندا ڕاوەستام، تەلەفۆنم لەگەڵ میوانەكاندا دەكرد، ناونیشانی ماڵی خۆمانم پێ دەدان.. بە تەلەفۆنو تەلەفۆنكارییەوە، زۆر سەرقاڵ بووم.. هێندەم زانی، ئۆتۆمبیلی ئەو دوو گەنجە لەبەردەمم وەستا.. ئەو دەم نزیكەی نۆ مانگێك دەبوو، هاتبوونە كۆڵانەكەمانەوە. ئەمن كە بە تەلەفۆنەوە سەرقاڵ بووم، ڕووم لێ وەرگێڕانو ویستم بچمە ژورەوە؛ هێندەم زانی یەكێكیان یەخەی براكەی گرتو لەو دەرگایەی دوور خستەوە، كە پیرێژنەكەی لێ دەهاتە دەرەوە. ئەوی دیكەشیان هەمان شتی براكەی كردەوە. پێك هەڵپژانو دەستیان كرد بە هاتوهاوار بەسەر یەكداو دەبەریەك ڕا دەچوونو پاڵیان بەیەكترەوە دەنا. شەڕەكەیان بە شێوازێك بوو.. ناچار منو هەندێك لە هاوماڵەكان، بەخێرایی چووین بۆ ناوبژیكردنیان. دیارە لەوەتەی هاتبوونە كۆڵانەكامانەوە، چاكە نەبێت، هیچی دیكەمان لێ نەبینی بوون. كاتێك چووینە پێشەوە؛ بۆئەوەی لێكیان بكەینەوە، برا بچووكەكەیان، كە دەستی بە یەخەی برا گەورەكەیەوە بوو، ئاوڕی دایەوەو پێی گوتین: هەر كەس دەیەوێت ناوبژی بكاتو پێكمان بهێنێتەوە، با هەقی خۆمم بۆ بگێڕێتەوە. هەرچۆنێك بێت، چووینە پێشەوەو لەیەكمان دوور خستنەوەو پێم گوتن: سڵاواتی لێ بدەن، ئەرێ ئێوە شەرم ناتانگرێت، وا لە بەرچاوی دایكتاندا پێك هەڵدەپژێنو دەنگەدەنگو شەڕتانە؟ چیتان لێ بەسەرهاتووە؟ گێرەوكێشەتان لەبەر چییە؟ توخودا برایەتیی ئاوها دەبێت؟ برا بچووكەكەیان گوتی: بەپێی ئەو ڕێكەوتنەی كە لە نێوانمادایە، ویستم دایكم بە باوەش هەڵبگرمو بیبەمە ژوورەوە؛ چونكە ئەو لە نەخۆشخانە لە قەرەوێڵەكەی هەڵی گرتو لە ئۆتۆمبیلەكەدا دای نا، ئێستەش حەقی خۆمە كە هەڵی بگرمو بیبەمە ژوورەوە.

برا گەورەكەیان بەدەنگێكی بەرز گوتی: شەش دانە مانگ كە من لە خولی فێربوون بووم لە پایتەخت، تۆ خزمەتی دایكمت كردووە.. گەرچی بەڵێنی زۆرت پێ دام كە لەگەڵ خۆتدا بیهێنیت بۆ پایتەخت، بەڵام بەڵێنەكەت نەبردە سەر. سا لەبەر ئەوە تۆ لە من زیاتر، خزمەتت كردووە.

هاوڕێكەم گوتی:

هەموان سەرمان لەم كارەیان سوڕمابوو، سەرسامی سەرتاپای داگیر كردبووین.. چونكە هەر یەكێك لەم دوو گەنجە ئامادەبوون لە پێناو هەڵگرتنی دایكیاندا بەشەڕ بێنو هەر لەو پێناوەشدا بمرن.. من لەم كاتەدا فرمێسكی چاوم سەر ڕێژی كردو چیدی نەمتوانی ڕێ لە فرمێسكە قەتیساوەكانم بگرم. هەرچەندە چەندان ڕێچارەی جۆراوجۆرمان بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشەیە گرتە بەر، بەڵام هەر پێك نەهاتن؛ چونكە برا بچووكەكەیان دەستبەرداری هەقی خۆی نەدەبوو.

خودای بانی سەر ئاگادارە، بۆ ماوەی زیاتر لە سەعاتێك وەستاینو هەوڵمان دەدا نێوانیان خۆش بكەینەوەو پێكیان بهێنینەوە.. لەم ماوەیەدا چی جارە كە سەیری چاوی دراوسێكانم دەكرد، لەبەر زۆری ئەو هە ڵویستانەی ئەم دوو برایە باسیان دەكرد، دەمبینی نوقمی فرمێسك بوون.

هەر یەكێكیان دەیگوت تۆ ئەوەو ئەوەت بۆ دایكم كردووە، من هیچ شتێكی ئەوتۆم بۆ نەكردووە.. هەتا برا بچووكەكەیان گوتی: لەكاتی حەجكردنیدا منی لە هەڵگرتنی دایكم بێبەش كردو هەر خۆی ئەو كارەی كرد.. توخودا هاوماڵینە، ئەوە ڕەوایە؟

برا گەورەكەش بە ئاهێكی قووڵەوە گوتی: بارودۆخی كاروبار، ناچاری كردووم، لە خزمەتكردنی دایكمدا كەمتەرخەم بم.. سا لەبەرئەوە من بۆ كارە تایبەتەكانی دەرەوەی ماڵ لەپێشترم؛ تا قەرەبووی ئەو خزمەتە لەكیسچووەی دایكم بكەمەوە، كە لەباس نایەت.

لە كۆتاییدا زانیمان، كە پێشتر ڕێكەوتنێك لە نێوانیاندا هەبووە، بەجۆرێك بە نۆرە خزمەتی دایكیان لەماڵەوە بكەن؛ ڕۆژێك برا گەورەكەو ڕۆژێكیش برا بچووكەكە.. بەڵام وەك خۆیان باسیان دەكرد، لەكاتی چوونە دەرەوەی دایكیان لە ماڵ بۆ نەخۆشخانە، یان بۆ گەشتو گەڕان، هەمیشە مشتومڕو ناكۆكی لە نێوانیاندا سەری هەڵداوە.

ئێمە بەدەستیانەوە دامابووین، كەسیان سەریان بۆ ئەوی دیكەیان نەوی نەدەكرد.. بۆ چارەسەری ئەم گرفتەیان، خەریكبوو دایكیان هەڵبگرمو بیبەمەوە خانووەكەیان؛ تا گرفتەكە یەكلایی بكەمەوەو بگەڕێینەوە بۆماڵەوە.. لەم كاتەدا مامۆستای مزگەوت هاتو سڵاوی لێ كردینو بە برا بچووكەكەی گوت: مەگەر لەگەڵ یەكدا ڕێك نەكەوتن لەسەر ئەوەی بە نۆرە خزمەتی دایكتان بكەنو منیش شایەت نەبووم لەسەر ڕێككەوتنەكەتان؟!
ئیدی زانیمان مامۆستاش ئاگای لە حاڵیانەو جارێكیان لەكاتی چوونیدا بۆ نوێژی بەیانی، ناوبژی كردوونو پێكی هێنابوونەوە.. پاشان مامۆستا، ئەم چارەسەرەی ئێستەی بۆ دانان، كە بینیت هەردووكیان لەكاتی چوونەدەرەوە لە ماڵ، یان گەڕانەوە بەیەكەوە دایكیان بەڕێزەوە هەڵدەگرن.

لە كۆتایی ئەم بەسەرهاتەدا دەڵێم:

هیوادارم خزمەتی زەحمەتی دایكو باوكمان لەبیر نەچێت؛ چونكە ئەوان لە گەورەبوونی ئێمەدا پیربوونو هەرچییەكیان لە تواناد ا بوو بێت بۆ خزمەتی ئێمە، درێغییان نەكردووە.



# خۆشەویستی کردارە

ژنێکی پیر، بە پیرەمێردەکەی هاوسەری گوت:

کۆتاجارم بیر نایەت، کە پێت گوتبم: خۆشم دەوێیت.

هاوسەرەکەی گوتی:

بەڵێ، دەمێکە پێم نەگوتوویت، بەڵام ئەو کاتەت لەبیر نایەت، کە بەهۆی چێشتلێنانەوە دەستت سووتا، پێم گوتی:

ئای خۆزگە دەستی من بووایە، نەك دەستی تۆ، مەگەر ئەوە خۆشەویستیی نییە؟!

ئەو دەمەی پزیشك پێی گوتیت: چاوەکانت کز بوون، لەبیرت نایەت، لەپاڵ پزیشکەکەدا چیم پێ گوتیت؟ پێم گوتیت:

ئەمە چاوەکانی منە، هەمیشە لە نزیکی تۆیە، سا دڵتەنگ مەبە، دەی مەگەر ئەمە، خۆشەویستی نییە؟!

ئەو دەمەی لە نەخۆشخانە بووین، پزیشك پێی گوتم: هاوسەرەکەت، شەکەتو ماندووە، لەبیرت نایەت، چۆن لە دەرکەی نەخۆشخانەوە، هەتا جەرگەی ماڵەوە، بەکۆڵ هەڵم گرتیت.. مەگەر ئەمە خۆشەویستی نییە؟

ژنە پیرەکە گوتی:

بەڵێ، دەزانم، چەندەت من خۆش دەوێت؛ من سوعبەتم لەگەڵدا کردیت، بەڵام پێم خۆشە، ئەو شتانەی باست کردن، بۆم بڵێیتەوە؟

پیرەپیاو گوتی:

دەزانم، پێت خۆشە ئەو باسانە بڵێمەوە، بەڵام پێویست ناکات.

ژنە پیرەکە گوتی:

دە باشە، پێم بڵێ:

تۆم خۆش دەوێت.

لەم کاتەدا کە هەردوو کیان بە پلیکانەی ماڵەکەدا دەهاتنە خوار، پیرەپیاو پێی گوت:

وریا بە، لە پلیکانەکان بەر نەبیتەوە، نابینی چەندە بۆت بە خەمەو چەندەم خۆش دەوێیت؟!

# براوەبە بێ ئەوەی شکست بە کەسانی تر بهێنیت!

بێگەرد فارس

لەساڵی ١٩٧٤، لـە ئاهەنگـی چالاکییەکانـی کۆتایی قوتابخانـەدا، لـە کوبانـج باسـو لـە مالیزیـا، مەهاتیـر موحەممەد میوان بوو، ئەو کات هێشتا نەبووبوو بە وەزیری پەروەردە، پاش بەڕێوەچوونی ئاهەنگەکە، مەهاتیر هەسـتا بۆ پێشکەشـکردنی بیرۆکەیەك، ئەویش پێشـبڕکێیەك بۆ مامۆستایانی خوێندنگاکە، بیرۆکەکەش ئەوەبوو میزەڵدانی دابەش کرد بەسـەر مامۆسـتاکانداو دەبوو هەریەکە فوو لە میزەڵدانێك بکەنو بیبەستێت بە پێیەکانییەوە، مامۆستاکان داواکـەی مەهاتیریـان جێبەجـێ کـرد، پاشـان داوای لێ کردن لە سـنوورێکی دیاریکـراوی گۆڕەپانـی قوتابخانەکە بەشـێوەی بازنەیی کۆببنەوەو پێی وتـن: کۆمەڵێك دیاری پاداشـتم بـۆ ئامادە کـردوون ئەگەر هەریەکێـك لە ئێوە، لە مـاوەی خولەکێکدا، پارێزگاری لـە میزەڵانەکەی بکات؛ ئـەوا دەبێتە خاوەنی دیارییەکە، کاتی پێشـبڕکێ دەسـتی پێ کرد، هەرمامۆسـتایەك هێرشی دەکردە سەر میزەڵدانی مامۆسـتا هاوڕێکەی، هەریەکێك دەیویست میزەڵدانی ئەوی تـر بتەقێنێـت، هەتـا کاتەکەیان تـەواو بوو، لـەو کاتەدا مەهاتیر بەسەرسـامییەوە لێیانـی دەڕوانیو پێی گوتن من داوام نەکـرد، هیچ یەکێك میزەڵدانی هاوڕێکەی بتەقێنێت! ئەگەر هەریەکێك لە ئێوە ماوەی خولەکەکە بوەسـتایە، بێ هێرشـکردنو بڕیـاری نەرێنانـە دژی بەرامبەرەکەی؛ ئەوا هەمـوو دەبـوون بە خاوەنـی دیاری، بـەڵام بیرکردنەوەی نەرێنیانە زاڵ دەبێت بەسـەر هەموانـدا، هەموو یەکێك لە ئێمە، بۆ سـەرکەوتنی خۆی بیر لە شکستی بەرامبەرەکەی دەکاتەوە، لە کاتێکدا سەرکەوتن بەردەستە بۆ هەموان، بەڵام بەداخەوە، هەندێك هەنگاو دەنێت، هاوڕێکەی لەناو بەرێت؛ بۆئەوەی خۆی براوە بێت.

بەداخـەوە، ئەمە حاڵی ڕاسـتەقینەی ژیانی ڕۆژانەی زۆربەمانـە، ئـەو مامۆسـتایانە دەیانتوانـی بڵێـن واز لە میزەڵدانەکـەی من بێنـەو میزەڵدانی خۆت بۆ خۆت، بەبێ ئـەوەی پەلامـاری یەکتر بـدەنو هەردوولا نەبنـە براوەو خاوەنی دیاری، سـەرکەوتنی تۆ نەبەسـتراوە بە شکسـتی کەسـانی ترەوە، نیازت باش بکـەو خوای گەورە حاڵت باش دەکات، هەرکاتێـك ئیرەیـیو ڕقو کینـەت لـە دڵدا لابردو خوازیاری خۆشـی کەسـانی تربیت، ئـەو کات خوای گەورە سەرکەوتنی دونیاو قیامەتت دەکات.






ئا: سەلاح عیسا

خوێندکاری ماستەر لە تورکیا


بەشی چوارەم

# ڕۆڵی پەروەردەو فێرکردن لەگەشەسەندنی ئابووریدا

## کاریگەریەکانی پەروەردە لەسەر پێشخستنی ئابووری

لە پێش سەدەی نۆزدەیەمەوە، بایەخێکی ئەوتۆ بە وەبەرهێنان لە سەرمایەی مرۆیی نەدەدرا، بەشێوەیەکی تایبەت لە هیچ وڵاتێکدا، بەشێوەی پارە خەرجکردن بۆ فێربوون، یاخود ڕاهێنانی کرداری لە کارکردندا بۆ فێربوون بەشێوەی زانستی..... هتد، تەنها چەند شێوازێکی بچووکی بەرهەمهێنانی لەیەکچوو هەبوون، بەڵام لەم سەردەمەی کە ئێستا ئێمەی تێدا دەژین، گۆڕانێکی گەورە هاتۆتە کایەوە لە بواری جێبەجێکردنی زانستو زانیارییەکان لە پێشخستنی بەرهەمە نوێیەکاندا، ئەمەش بە ئامانجی زیادکردنی بەرهەمەکان بە شێوازی زانستی، کە یەکەمین جار لە بەریتانیای گەورە ئەمە ڕوویدا، دواتریش وردە وردە بۆ وڵاتەکانی تر گواسترایەوە.

لەماوەی سەدەی بیستەمدا، زانستو ئەزموونەکانو بەدەستهێنانی زانیاری، دیارترین دیاردەن، کە لە کەسەکاندا دەبینرێن، بە ئامانجی زیادکردنی بەرهەمی نەتەوەیی، بە شێوەیەك ئەم سەدەیە ناو دەبرێت: بەسەدەی (سەرمایەیی مرۆیی). ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە هۆکاری سەرەکی بۆ دیاریکردنی باشترین ئاستی بژێویی هەر وڵاتێك، ئەوەیە کە تا چەند سەرکەوتوو بووە لە پێشخستنو سوودوەرگرتن لە ئەزموونو زانیارییەکان، هەروەها تا چەند توانیویەتی بەهۆی گەشەی زانستەوە، لایەنی تەندرووستیو ڕۆشنبیریی دانیشتوان بەرەو پێشەوە ببات.

کەواتە: لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆیی زۆر گرنگە، بەتایبەتی بۆ ئەو وڵاتانەی کە سەرمایەی سرووشتیان نییە، سەرمایەی مرۆییش بۆ هیچ وڵاتێك نایەتە بەرهەم، هەتا گرنگیی زۆر بە پەروەردەو فێرکردن نەدات، یاخوود تا چاکسازی لە کواڵتیی پرۆگرامەکانی قوتابخانەو دەزگا پەروەردەییەکاندا نەکات، ئەم چاکسازیو گرنگیدان بە پەروەردەو فێرکردنە، نابێت تەنها لە قۆناغی سەرەتایی، یا ناوەندی بێتو ئیتر بوەستێت، بەڵکو دەبێت بەردەوام بێت تا ئاستەکانی زانکۆو دوای زانکۆش.

خاڵێکی تر، کە بۆ وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆیی گرنگە، گرنگیدانە بە خوێندنو فێرکردنی کچانو ژنان؛ چونکە ئەوانیش نیوە، یان لەهەندێ وڵاتدا لە نیوە زیاتری کۆمەڵگە پێك دەهێنن، بۆیە ئەمانیش وزەیەکی زۆرن، ئەگەر وەك پیاوان گرنگیان پێ بدرێت؛ ئەوا کاریگەریی گەورە لەسەر پێشکەوتنی ئابووریی وڵات دروست دەکەن، یاخود ڕێگەدان پێیان بەکارکردن لەدەرەوەی ماڵ لەپێناو دابینکردنی ژیانێکی باشتر بۆ خێزانەکەیان، یاخود گرنگیدان بە تەندرووستی خێزانەکانو کەمکردنەوەی ڕێژەی لەدایکبوون بەتایبەتی لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا، کە بەدەست زۆریی ڕێژەی لەدایکبوونەوە دەناڵێنن، بۆیە هەر

منداڵێکی کەمتر، لێرەدا داهاتێکی زیاتر بۆ خێزان دەگێڕێتەوە، ئەمەش بێگومان هەر لەڕێگەی پەروەردەو ڕۆشنبیری تاکەکانەوە دەکرێت، بەتایبەتی ئافرەتان.

کەواتە: وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆیی، پرۆسەیەکی گشتگیرەو بۆ گەیشتن پێی ئامادەکارییەکی هەمەلایەنەی دەوێت لە بواری چاکسازیی ڕیشەیی لە بواری پەروەردەو فێرکردنو ڕۆشنبیرکردنی تاکەکانی کۆمەڵگەدا، بۆئەوەی بزانین پرۆسەی پەروەردە چۆن کاریگەری لەسەر پێشخستنی ئابووری دادەنێت، تاوەکو سەرمایەی مرۆیی بەرهەم بهێنێت، ئەوا بەم شێوەیەی خوارەوە لەو کاریگەرییانە دەدوێین:-

**١ - کاریگەری پەروەردە لە سەر کرداری وەبەرهێنان:**

هۆکارەکانو شێوازەکانی فێربوون لە هەر وڵاتێکدا، بە هۆکارێکی گرنگیی پێکهێنانی پرۆسەی وەبەرهێنانو گەشەکردنی ئابووری، لەو کۆمەڵگەیەدا دادەنرێن، ئەمەش لەوانەیە بەشی ناردنە دەرەوەش بکات، لەڕێگای بازرگانیی دەرەکییەوە، کە هۆکارێك دەبێت بۆ بەدەستهێنانو هێنانە ناوەوەی پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان، بە ئامانجی دابینکردنی تەندروستیی باشو دابەشکردنی خۆراك، هەروەها فێرکردنی سەرەتاییو ناوەندی کە ڕۆڵی سەرەکییان دەبێت لە بەرزکردنەوەی وەبەرهێنانی کرێکاراندا لە گوندو شارەکاندا. فێرکردنی ناوەندیو لە گەڵیشیدا ڕاهێنانی پیشەیی، بەدەستهێنانی ئەزموونو توانا کارگێڕییەکان ئاسان دەکەن، هەروەها هۆکاری یارمەتیدەرن بۆ پێشخستنی تەکنەلۆجیا، فێرکردنی ناوەندیو بەرەو سەروتر، بنەمایەکی کاریگەرن بۆ گەشەپێدانی دەزگا سەرەکییەکان، حکومەت، یاساکانو سیستەمی دارایی، کە هەر ئەمانەشن دەتوانن گەشەی ئابووری بهێننە کایەوە، ئەو ئەزموونانەی کە لەوڵاتان لەم ڕووەوە بینراون، لە سەر ئاستی بەشێك، یاخود هەموو پێشکەوتنە ئابوورییەکان، دەتوانن گەواهی ئەم ڕاستییانە بدەن. بۆ نموونە بەشێك لەو لێکۆڵینەوانەی کە لەم بوارەدا کراون، ئەوەیان بەڕوونی دەرخستووە، هەر بەدەستهێنانی زیادەیەك لە قازانجدا، بەستراوەتەوە بە هەر ساڵێکی زیاتر لە فێربووندا، ئەمەش ئەوە دەردەخات: تا ڕادەی فێربوون زیاد بکرێت؛ ڕێژەی قازانجیش زیاد دەکات.

دەبینین لە بواری کشتوکاڵدا، توێژینەوەکان دەریان خستووە، ئەو جووتیارانەی کە خوێندەواریان هەیەو دەتوانن ئامێرە تازەو سەردەمییەکان بەکار بهێنن، ڕێژەی بەرهەمهێنانیان زیاترە لە نەخوێندەوارەکانو ئەوانەی هەر بە ئامێرە کۆنەکان کشتوکاڵ دەکەن. بۆ نموونە: لە تایلەند، ئەو جوتیارانەی کە چوار ساڵ، یاخود زیاتر لە قوتابخانە خوێندوویانەو خوێنەوارییان بەرزترە، ڕێژەی بەرهەمیان، سێ ئەندازەی ئەو جوتیارانە زیاترە، کە کەمتر لەوانیان خوێندووە، لێرەدا کاریگەری خوێندنمان بەئاشکرا بۆ دەردەکەوێت.

هەروەها لە وڵاتی نیپاڵ، ئەوانەی کە بەلای کەمەوە، حەوت ساڵیان لە قوتابخانە خوێندووە، چوار یەك زیاتر بەرهەمی گەنمیان زیاتر بووە، هەروەها لە ١٣٪ بەرهەمی برنجیان زیاتر بووە.

بەهەمان شێوە فێربوون، هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیاو گۆڕانکاری لە پیشەسازیدا، ڕوونکردنەوە ئامارییەکانی پیشەسازی جلوبەرگو ئەندازیاری لە سریلانکا، دەریان خستووە، کە چۆن ئاستی فێربوونو ئەزموونی کرێکارەکان، ڕۆڵیان هەبووە لە تێکڕای گۆڕانی هونەریی لە کۆمپانیاکانی دروستکردندا.

کاریگەری فێرکردن لە سەر سرووشتی گەشەو ناردنە دەرەوەکان، کە دواتر ڕۆڵی کاریگەری هەیە لەسەر گەشەی تێکڕای ئابووریی وڵات، هۆکارێکی ترە کە مرۆڤ دەتوانێ لەو ڕێگەیەوە، کاریگەری لەسەر کۆی پێشکەوتنەکان دابنێت. فێرکردنو ئەزموونەکان لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا هۆکاری گرنگن کە کار لە ڕادەو سرووشتی وەبەرهێنانو کرداری بازرگانیش دەکەن، زۆر جار دەبێت ئەو کرێکارانەی کە خاوەن ئەزموون نین، لەکارگەیەکی نوێدا ناچاردەبن فێری خوێندنەوەو نووسینو ژمارەکردن ببن، بۆ ئەمەش دەبێت بچن لە قوتابخانەکانی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەییدا بە دەستی بهێنن.

کەواتە: لەمەوە دەردەکەوێت، فێرکردن کاریگەریی گەورەی لە سەر کرداری بەرهەمهێنان هەیە، ئەمەش مانای ئەوەیە، جیاوازییەکی گەورە لە تێکڕای بەرهەمی ئەو کەسانەدا هەیە، کە خوێندەوارییان هەیەو لەگەڵ ئەوانەی کە نەخوێندەوارن، هەروەها ئەو وڵاتانەی کە بایەخی زیاتر بە فێرکردن دەدەن، لە ڕووی ئابوورییەوە بەرهەمیان زیاترە، هەر چاکسازییەك لە پرۆگرامی خوێندندا، زیادەی بەرهەمهێنان فەراهەم دەکات، بەتایبەتی وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆیی. زۆر جار ئەو وڵاتانەی کە تەنها سەرمایەی مرۆییان هەیە، پێشکەوتووترن لەوانەی کە سەرمایەیەکی زۆری سرووشتیان هەیە، بەڵام چونکە زانیارییان نییە، ناتوانن سودی لێ ببینن، بۆ نموونە وڵاتێکی وەکوو یابان، کە بەوە ناسراوە سەرمایەی سرووشتی نییە، بەڵام بەهۆی گرنگیدان بە پەروەردەو فێرکردن، بووە بە خاوەن سەرمایەیەکی گەورەی مرۆییو لە ڕیزبەندیی یەکەمی وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئابووریش دادەنرێت.

# دیداری تۆ!

گەرمیانی

چی لە خۆزگەو ئاواتی گەیشتن بە دیداری تۆ، گەورەترە لە دڵدا؟!

چی خەیاڵێك لەو خەیاڵە ناسكترە، كە گەیشتن بە دیوانی تۆ، وێنا دەكا؟!

چی هەستێك لەو هەستە ناسكترە، كە ساتەوەختی لیقا گوزارش دەكا!!

دەبێ ئەویندار، چۆن شەوی لێ بڕوا، كاتێك سبەی، وادەی دیداری مەحبووبی دڵی بێ!

گوێرو نابینایە ئێستا، ئەو لە داخی ڕۆژی ڕووت
بۆیە ڕەشپۆشو فەقیرو ماتو بەستەزمانە شەو - سەید كامیل -

دەبێ خورپەی دڵو لەرزینی بەدەنو هەیبەتی حزوور، چی بەسەر عاشقی لیقەوماودا بێنن؟!

دەبێ كاتێ ڕۆژی ئاسمانی ئەوینو مانگی چواردەی جەماڵی یار دەردەكەوێت، بەچی نیگایەك بتوانی، تەماشای نووری ڕوخساری بكەیو بەچی زمانێك ئیجازە بخوازی!

تۆ كە دەركەوتی، مەپرسە چی بەسەر دێ جانو دڵ
حاڵەتی شەونم تەماشاكە، بەوەقتی ڕۆژهەڵات - مەحوی -

بۆ ساتێك دەچیتە نێو ڕەوزەی ڕیزوانی دڵو لە دەفەری ڕۆحدا، ئارام دەگریو بە دیداری مەحبووبی تاڵبو مەتلووبی دڵت شاد دەبی!

دەگەی بە حوسنو جوانییەك، كە وەك ناری دەڵێت:

دەكا تەركی خەیاڵی خاڵی لەیلا
ئەگەر مەجنوون لە حوسنی، با خەبەر بێ!

گوێگرتنە لە سروودی ڕۆحو دروودی ئەوینو چرپەی ناخو ئاوازی ژیانو ڕازی حەیات!

هەستكردنە بە نەسیمی بەهەشتو شەونمی میهرو گفتوگۆیە بە زمانی خەندەو تێگەیشتنە لە ئیشارەتو تەلیسمی درووسی مەدرەسەی ئوستادی دڵ!

بێ قسەی غونچەی دەمت، كاتی تەبەسسوم ڕووبەڕوو
هەتكی شوعلەی بەرقو نەزمی دائیرەی پەروین دەكا - نالی -

لەوێدا زەمەن دەوەستێتو خەم دەڕەوێتو دڵ دەسرەوێتو ڕۆژ هەڵدێتو مانگ بە چارشێوی خەجاڵەت، ڕوو دەپۆشێت!

مەحاڵیش نییە، بە نوێژی شێوان، بگەی بە سروەی بەیان!

لە دوگمەی سوخمە. دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان
لە خەوفی تەلعەتی، ڕۆژ هەروەكوو شێت
بە ڕووزەردی هەڵاتو كەوتە كێوان -نالی-

لە دیوانێكدا، مرۆڤ لە هەموو باسوخواسێكی دونیا بێخەبەر بێو وجوودێك بۆ ماددە نەمێنێو سەعادەت ببێتە كاڵای باڵاتو هەموو كونجو كەلەبەرێكی ڕۆحت دابپۆشێ!

لەوێدا لە هەموو ئەنجاسو ئەدناسو ئەكدارێك، بەدوور بیو جگە لە ڕوخساری حەبیب، بۆ هیچ لایەك نەڕوانی!

ئیدی لەوێدا دەتوانی لە مەفهوومی جەننەت حاڵی ببیو بزانی؛ تا لە كۆتوبەندی ماددیاتو مەحسووسات ڕزگارت نەبێ، هەرگیز ناگەی بە ئۆخژنی دڵت! بەڵام گەر بتوانی خۆت لە هەموو ئەو شتانە موبەڕڕا كەی؛ ئەوا شایانی دیداری مەحبووبی خۆتی!

ئەوەندەی تۆ دەبینم؛ لێم دەشێوی
كە باخی جەننەتە، یا تەلعەتی تۆ -نەدەب-

نازداری ڕۆحو ئوستادی دڵم، لە حزەیەك لە دیداری تۆ، بە هەموو گەنجی قاروون ناگۆڕمەوە، من دەزانم، بۆ لای كێ هەنگاو دەنێمو لە حزووری كێدا، دەستەونەزەر ڕادەوەستم، من شاگردی كەسێكم، هەروەكوو وەفایی دەڵێ:

كردمیە مەجنوونی دەرودەشتانو فەرهادی زەمان
شۆخو سەلما ڕەنگو لەیلا دەنگو شیرین شەكەرێ

هەر بۆیە دوور لەو دیدارە، ڕۆژم شەوو، شەوم دەیجوورو عومرم بێسەمەرو دڵم پڕكەسەرو دیدەم پڕئەسرینە.. چونكە دووری لە دیدارت، وەك مەحرووم بوونە لە هەموو خۆشییەكانی وجوود!

ئەی تۆبە، لە دەس ڕۆژی فیراقو شەوی هیجران
وەی ڕۆ، لە هەراو كەشمەكەشی ساعەی حیرمان -حەریق-






# نامە نوورییەکان

## نامەی پەنجاو دوو

مامۆستای ئازیزم..

هاودەمیی زۆر کەسم کرد، کتێبگەلێکی زۆرم خوێندەوە، چیرۆکو ڕۆمانو بەسەرهاتی زۆرم موتالاّ کرد، وەلێ تا نەبوومە هۆگرو هاودەمی قورئان، ئارامی نەبووە میوانی دڵمو هەوری ڕەشی خەمم نەڕەوییەوەو ئۆخژنی دڵم نەهات، تەنها لەژێر سایەی قورئاندا، تامی ژیانم کرد!

ئەو کاتەی پیتەکانی قورئان، دڵۆپ دڵۆپ وەکو هەنگوین دەتکانە نێو ڕۆحم، ئەو کاتەی ئاوێتەی وشە پیرۆزەکانی پەروەردگار دەبووم، ئەو کاتەی پیرۆزترین پەیامم بە زوبانم دەخوێندەوە، ئەو کاتەی هەیبەتو جەلالو جەمالی سرووشی ئیلاهی، وەك زەمینلەرزە، دڵو دەروونی دەهەژاندم، هەستم بە تامو چێژی شادمانییەك دەكرد، کە هەرگیز لە هیچ شوێنێکی دی، وەدەستم ناکەون!

ئەو کات زانیم، هەموو چرکەیەکی ژیان بەبێ قورئان، تەنها داخو حەسرەتە!!

ئازیزم، ژیان لەگەڵ قورئان، واتە: هەستکردن بە ژیانو هەڵدانەوەی پەردە لەسەر هەموو حەقایقو ڕاستییەکانی ژیان!

واتە: زیندووبوونەوەی دڵو زیندەگیی ڕۆح!

خوێندنەوەی قورئانو ڕامان لە مانای بەرزی، واتە: دەستگرتن بە چرای ڕووناکی هیدایەتو گرتنی ڕێگای ڕاستو بەردەوامبوونو سوکنایی دڵو دڵنیایی هەمیشەیی.

﴿ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴾ الفرقان: ٣٢

هەر بۆیە پێغەمبەری نازدارمان، تەنها بەوە ڕانەدەوەستا، کە شەوانە لە خزمەتی ئایەتە پیرۆزەکاندا، بە ئەسرینی چاوی، گەورەترین، داستانی خۆشەویستی تۆمار بکاتو تا بەری بەیانی، بە دەم هەنسکەوە، قورئانی پیرۆز بخوێنێ!

بەڵکوو دەچووە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو پێی دەفەرموو: اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ قورئانم بۆ بخوێنە! عەبدوڵڵا دەیگوت: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ ئایا من بۆ تۆی بخوێنم، لەکاتێکدا ئەم قورئانە، بۆ تۆ هاتووە؟! دەیفەرموو: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي من پێم خۆشە، لە کەسانی دییەوە، گوێبیستی بم!

چونکە ئەو، شەیدای دەنگی ئیبنو مەسعوود بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێك دەیەوێت، قورئانی بە تەڕو پاراوی گوێ لێ بێ، وەکوو خۆی کە دابەزیوە، با گوێ لە خوێندنەوەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بگرێ!

عەبدوڵڵا دەفەرموێ: سوورەتی «النساء»م بۆ خوێند، تا گەیشتمە ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾ النساء: ٤١ فەرمووی: تا ئێرە، بەسە!

کاتێك سەرم هەڵبڕی، بینیم فرمێسك زەنگۆڵ زەنگۆڵ، بەسەر ڕوومەتیدا دێتە خوارێ!

هیچ ژیانێك، ناگاتە چرکەیەك ژیان لەگەڵ قورئان، هیچ لە زەتو خۆشییەك، ناگاتە شیرینی تیلاوەی قورئان، وەلێ بۆ کەسێك لێی حاڵی ببێت!

﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ ق: ٣٧

بۆیە خالیدی کوڕی وەلید، لە کۆتایی تەمەنیدا، قورئانی گرتە باوەشو دەستی کرد بە گریانو دەیگوت:

جیهاد سەرقاڵی کردمو نەمتوانی لە خزمەتتدا بم!

ئازیزم با ئیدی بەشێکی تەمەنمان لە خزمەت خوێندنەوەو لەبەرکردن و ڕامان لە وشەو واتاکانی قورئاندا بەسەربەرین!



# لەگەڵ حەقیقی شاعیردا

شاعیر ناوی عەباسی کوڕی عەلی پاشای کوڕی برآیم ئاغای تالآوە، ساڵی ١٩٠٢ی زایینی لە گوندی مەرجانئاوای ناوچەی مەهاباد لەدایك بووەو ساڵی ١٩٩٧ لە شاری بۆکان کۆچی دوایی کردووە.

شاعیر خاوەنی شیعری جوانو هەڵبەستی ناسکەو جێگەی ڕەزامەندیی گەورەشاعیرانی وەك هێمنو هەژارو سەید کامیلی ئیمامی بووەو تەخمیسەکەی لەسەر شیعری نالی، شایەدی بۆ دەدات.

لە شوعلەی ڕووی کەمەرچین زێڕو زێوان
چ زەهرەی زوهرەو کەیوان کە بێ وان
شوعاعی میهرو مەه لاچوو لە نێوان
لە دوگمەی سوخمە نوێژی شێوان
بەیانی دا، سپیدەی باغی سێوان
لەبەر ئەبرۆی کەوانو تیری سەر ژێت
هیلال ئەو شۆ، بە خۆی گوت: تەنگ ئەبێ جێت
خزی ڕووبەندو کاتێ کەوتە بەربێت
لە خەوفی تەلعەتت ڕۆژ هەر وەکوو شێت
بە ڕووزەردی هەڵاتو کەوتە کێوان
شەمیمی عەتری زوڵفت عەینی شەوبۆ
شکاندی پشتی گوڵ، خونچەی دەمی تۆ
نیگارم وەك گوڵە، هەم ڕەنگە، هەم بۆ
مەکە مەنعی پەشێوی دڵ کە ئەمشۆ
پەشێواوە لەبەر پەرچەم پەشێوان
دووزوڵفی عەنبەرینی نافەمیشکن
دوو چاوی مەستی بیمارو پزیشکن
لە چاو من، جۆیبارو جۆگە ویشکن
دوو چاوی من کەوا، کەیلی سریشکن
دەپێون ئاوی بەحری خوێ بە پێوان

دەردی دووری

دەردی دووری زۆر گرانە، دڵبەرا هیجران بەسە
دڵ وەکوو پەروانە سووتا، چاوەکەم سووتان بەسە
عاقڵان شەیدا دەبن، ڕووبەندی سەر ڕوو لا مەدە
عاشقان کوشتەی جەفاتن، قەتڵی مەزلوومان بەسە
مورغی دڵ. پابەندی دانەوداوی خاڵەو زوڵفی خاو
گیری بەندیخانە تاکەی، بەندی بێئامان بەسە
هەرچی بووم، بردی بە تاڵان، تورکی مەستی چاوەکەت
تاقەتو سەبرو قەرارم پێ نەما، تاڵان بەسە
شاهیدم فرمێسکی خوێنینە، کە تۆ جەرگت بڕیم
عاشقی ڕووتم ئەگەر، تەفسیرە گەر، تاوان بەسە
ئێستەکەش مەجنوونو لەیلێ هەن لە عەسری تازەدا
شێتو سەرگەردانی تۆم، حەیرانی تۆم، حیرمان بەسە
گەنجی عیشقت، پڕ بە وێرانەی دڵەو من پێم کەمە
تا زیاد بێ، چاوەڕێی دیشم، مەڵێ: ئیحسان بەسە
گەر قسەی عیشقی گوڵو بولبول، لە لات ئەفسانەیە
تۆ گوڵی خەندانو ئەمنیش بولبولی گریان بەسە
ئاورت بەر دا دڵو گیانی حەقیقی چاوەکەم
دەردی بێدەرمانە عیشقت، دەردی بێدەرمان بەسە